عیزەت فەتاح حەمە ساڵح

# هەورامان

توێژینەوەیەکی سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجی

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستان

# هەورامان

## توێژینەوەیەکی سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجی

عیززەت فەتاح حەمە ساڵح

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

سلێمانی ٢٠٠٦

## سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی کوردستان

دەزگایەکی کەلتوری‌یە لەساڵی ١٩٩٢دا دامەزراوە، ئامانجەکەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستی‌یە لەبوارەکانی ئاسایشی نەتەوەیی‌و سیاسەتی نێو دەوڵەتان‌و ئابوری‌و مەسەلە ستراتیجییەکان‌و مەبەستی بەدەست هێنانی قازانجی ماددی نیە.

هەمو ئەو لێکۆڵینەوانەی کەسەنتەر دەریاندەکا، گوزارشت لەڕاو بۆچونی خاوەنەکانیان دەکەن‌و بەپێی پێویست گوزارشت لەڕاو بۆچونی سەنتەر ناکەن.


- عیززەت فەتاح حەمە ساڵح
- هەورامان توێژینەوەیەکی سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجی
- سلێمانی ٢٠٠٦
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان
- ژمارەی سپاردن (٥٨٣)ی ساڵی ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی سەنتەر: ٩/٤٢/٦

## پێشەکی

هەورامان بەشێکە لەپێکهاتەی خاکی کوردستانو نەتەوەی کوردو زمانی کوردی. بەگشتی هەورامان لەدووبەش پێك هاتووە، کە بەهەورامانی(تەختو لهۆن) ناسراون. هەورامانی تەختو بەشی زۆری هەورامانی لهۆن کەوتۆتە سنوری کوردستانی رۆژهەلات، بەشێکی سنوری جوگرافی دەولەتی ئێرانی پێك هێناوە لەرۆژئاواوە. بەشی کەمی هەورامانی لهۆن کەوتۆتە سنوری جوگرافی هەرێمی کوردستانی عیاقەوە، لەلای باشووری رۆژهەلاتەوەو سەر بەپارێزگای سلێمانی - قەزای هەلەبجەیە. ئەم توێژینەوەیە لەسەر ئەم بەشەی هەورامانی لهۆن- هەرێمی کوردستانی عیاق، ئەنجام دراوە.

کۆمەلگای هەورامان، کۆمەلگایەکی دێرینو خاوەن کلتورێکی رەسەنی کوردییە. بەلام زۆر بەکەمی لەسەری نووسراوە، هەندێك لەو نووسینانەش هەلەو کەم کورتیان پێوە دیارە. هەر ئەو هۆکارانە بونەتە هاندەرێك کەتوێژەر لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی هەورامان توێژینەوەکەی ئەنجام بدات.

گرنگیی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کە لەکۆمەلگایەکی خۆجێی دێرینی گەلی کورد دەکۆلێتەوە کەتا ئێستا زۆر بەکەمی بەرێبازی

ئەکادیمیی زانستی لەسەری نوسراوە، هەروەها ئەمە یەکەمین تێزی ماستەرە لەبواری کۆمەڵناسیدا کە بەزمانی کوردی لەسەر هەورامان نوسرابێت، جگە لەوە توێژەر بەووردەکاریەوە پێکهاتەی کۆمەڵگای هەورامانی لێك داوەتەوە، لەڕووی دیاری کردنی بنچینەی هەورامییە ڕەسەنەکانو ئەو خەڵکانەی تر کە بەکۆچ هاتونەتە هەورامان وبە تێپەڕبوونی کاتو سەردەم لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا تواونەتەوەو بوون بەهەورامی وە لەسەرو ئەوانەشەوە وەك پێویستییەك لەپێویستیەکانی گەلی کورد کەدەبێت دەرەنگ یازوو لەپێکهاتەو بەشەکانی بکۆڵرێتەوە، جا بەگشتی بێت یا بەشێوەی بەش بەش، ئەمە دەست پێشخەرییە لەبەشێکی بچوکی توێژراوەتەوە. هەروەها ناساندنی کۆمەڵگای هەورامانە بەهەموو چینو توێژی گەلەکەمانو گەلانی ترو هەروەها هاندەرێك بێت بۆ خوێندکاران کەتوێژینەوەی زیاتر ئەنجام بدەن لەسەر ئەو کۆمەڵگایەو کۆمەڵگا خۆجێییەکانی تری کوردستانو بەچاوێکی کراوەو راستگۆیانە دوور لەخواستو مەرامو ئارەزووە تایبەتییەکان، هەروەها هەولێکە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکی زانستیی ئەنترۆپۆلۆجیو خزمەتێکی کاروانی زانستە. لەگەڵ ئەوانەشدا پینەیەکی هەڵەو کەمو کورتیەکانی نووسینو لێکۆڵینەوەکانی پێشترە کە لەسەر ئەو کۆمەڵگایە ئەنجام دراون، دوایین گرنگی ئەوەیە لەڕێی پێشنیارو راسپاردەکانەوە چەند زانیارییەك روبەڕوی دامو دەزگا بەرپرسەکان بکرێتەوە.

ئامانج لەتوێژینەوەکە ئەم خالانەیە:-

١-دەرخستنی شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هەورامان.

٢-ئاماژەکردن بەژیانی ئابوریی کۆمەڵگای هەورامان.

٣-نیشان دانی ژیانی کلتوریی کۆمەڵگای هەورامان.
٤-دەست نیشان کردنی ژیانی رامیاری کۆمەڵگای هەورامان.
٥-زانینـــی فاکتـــەرەکانی داببنکردنـــی کۆمەڵایـــەتی کۆمـــەڵگای هەورامان.
٦-دیاری کردنی کێشەو گیروگرفتەکانی کۆمەڵگای هەورامان.
٧-ئاشکراکردنی پێویستییەکانی کۆمەڵگای هەورامان.
٨-پێـدانی زانیـاری بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەو گیروگرفتـەکانی کۆمەڵگای هەورامان.

دیارە هەر بابەتێکی زانستی یا هەر زیادەیەکی زانستی کە لەدایك دەبێـت دەچـێتە ژێـر چـەتری یـەکێك لەزانسـتەکانی سروشـتی یامرۆیی‌یـــەوە. ئـــەم توێژینەوەیـــە بابەتێکـــە لـــەبواری سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجیادا ئەنجام دراوە سەر بەزانستە مرۆیی‌یەکانە.

ئەم توێژینەوەیە کە ساڵی ٢٠٠٥ توێژەر پلەی ماستەری لەزانکۆی سلێمانی پێ وەرگرتوە، لەدوو دەروازە پێك هاتووە.

دەروازەی یەکەم لایەنی تیوری‌یەو لەدوو بەش پێك هـاتووە. بەشـی یەکەمی دوو باسە، کەباسی یەکـەمی چوارچێوەی باسـەکەو دەسـت نیشان کردنـی چـەمك و زاراوەکـان دەگرێتـەوە. باسـی دووەم کورتـە مێژوویەکی هەورامان دەگرێتەوە. بەشی دووەمی پێنج باسە، لەباسـی یەکەمەوە دەست پێ دەکاتو لەباسی پێنجەمـدا کۆتـایی دێـت بـەم جۆرە:- باسی یەکەم ژیانی کۆمەڵایەتی، باسی دووەم ژیـانی ئـابووری، باسی سێیەم، ژیانی رامیاری، باسی چوارەم ژیانی شارستانێتیو ژیارو کلتوری هەورامان، باسی پێنجەم داببنکردنی کۆمەڵایەتی‌یە.

دەروازەی دووەم لایەنی پراکتیکی‌یە کە لـەدو بـەش پێـك هـاتووە، بەشی یەکەمی دوو باسە. باسی یەکەم پلان‌و رێبـازی توێژینەوەکەیـە. باسی دووەم سیما گشتی‌یەکانی نموونەی توێژینەوەکەیە. بەشـی دووەم خستنە ڕوو و شیکردنەوەی ئەنجامەکانی توێژینـەوە پراکتیکییەکەیـە لەگەڵ کۆتایی‌و دەرەنجام‌و پێشنیارو پاشکۆو سەرچاوەکان.

توێژەر

# بەشی یەکەم

## چوارچێوەو سروشتو میتۆدی باسەکە

باسی یەکەم: چوارچێوەی باسەکەو دەست نیشان کردنی زاراوەکان.

أ-چوارچێوەی باسەکە:-

١-سروشتی توێژینەوەکە.

٢-دیاریکردنی توێژینەوەکە.

ب-دەست نیشانکردنی چەمكو زاراوەکان:-

زاراوەکان The Concepts

١-پێکهاتەی کۆمەڵایەتی Social Structure

٢-ژیانی کۆمەڵایەتی Social Life

٣-هەورامان Avroman , Awraman , Hawraman

ج-جوگرافیای هەورامان:-

١-روبەری هەورامان. ٢-ژمارەی دانیشتوانی هەورامان.

٣-نشینگەی هەورامان. ٤-ژینگەی هەورامان.

د-شێوەزاری هەورامان.

باسی دووەم: مێژووی هەورامان.

١-قۆناغی کۆنی مێژووی هەورامان.

٢-قۆناغی ناوەندی مێژووی هەورامان.

٣-قۆناغی نوێی مێژووی هەورامان.

٤-مێژووی هاوچەرخی هەورامان.

## باسی یەکەم

# چوارچێوەی باسەکەو دەست نیشان کردنی زاراوەکان

### أ-چوارچێوەی باسەکە:

مەبەست لەچوارچێوەی باسەکە ئەمانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:

١-سروشتی توێژینەوەکە: بابەتی ئەم توێژینەوەیە باسێکی سۆسیۆئەنترۆپۆلۆجی‌یە، واتا لەو پەیوەندیانە دەدوێت کە لەنێوان یەکەکانی کۆمەڵگای هەوراماندا پەیدابوون، هەروەها دیاریکردنی کاریگەری ئەو پەیوەندیانە لەسەر یەکترو پێکهێنانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەورامان. بواری ئەم توێژینەوەیە باس‌و شیکردنەوەی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هەورامان دەگرێتەوە، بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان پشتمان بەلایەنی تیۆری‌و پراکتیکی بەستووە بەپێی ئەو سەرچاوە نوسراوانەی کەدەست کەوتون یا بەشێوەیەکی مەیدانی کۆمان کردونەتەوە، ئەم بابەتە سەر بەزانستە مرۆیی‌یەکانە.

٢-دیاریکردنی کۆمەڵگای توێژینەوەکە: ئەم توێژینەوەیە لەسەر بەشێکی هەورامانی لهۆن- بەشی هەرێمی کوردستانی عێراق ئەنجام دراوە. کەڕوبەرەکەی ١٠٤٢٧١کم٢.[1] ژمارەی دانیشتوانی(١٥٠٢) خێزانەو لە(٧٠٢٦) کەس پێك هاتووە، ئەوەش بەسەر(٢) شارۆچکەو(٢٠) دێ‌و لادێدا دابەش بووە، بەشێوەی هەڕەمەکی.[2]

---

[1] بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کشتوکاڵ‌و ئاودێری سلێمانی، بەشی هونەری، تۆمارە بلاونەکراوەکان.

[2] فەرمانگەی باری کەسێتی ناحیەی بیارەو ناحیەی خورماڵ، سەرژمێری ٢٠٠٥ بۆ مەبەستی دەنگدان‌و هەڵبژاردن، تۆمارە بلاونەکراوەکان.

هەرچەندە(فەرەیدون عەبدول) لەکارنامە زانستی‌یەکەی خۆیدا لەسەر رستەسازی زاری هەورامی ئاماژەی بەهەموو شارۆچکەو دێکانی هەورامانی لهۆن داوە نەخشەیەکی هەورامانی نیشان داوە کە لەمەکەنزی‌یەوە وەریگرتووە، بەڵام توێژەر بەشێکی هەورامانی لهۆنی کردۆتە ناونیشانی باسەکەی‌و لێی کۆڵیوەتەوە کە لەسنوری هەرێمی کوردستانی عێراقدایە.[٣] چونکە ئەو بەشە مەبەستەو توێژەر خۆی خەڵکی ئەو بەشەیەو شارەزایە لەژیانی کۆمەڵایەتی‌ی ناوچەکە.

**ب-دەست نیشان کردنی چەمك وزاراوەكان : The Concepts**

هەموو توێژینەوەیەکی زانستی بەتایبەتی توێژینەوە کۆمەڵایەتی‌یەکان‌و هەموو گریمانەو تیۆری‌و بیردۆزەو یاسایەك لەسەرەتاوە چەند بۆ چون‌و زاراوەیەکن کەتوێژەر مەبەستێکی هەیە لێیان، بۆیە دایان دەتاشێت‌و رێکیان دەخات‌و هێمایان بۆ دادەنێت‌و شی‌یان دەکاتەوەو وردەکاریەکانیان دەست نیشان دەکات‌و بەتێرو تەسەلی دەیانخاتە بەرچاو.

بەبێ بیروبۆچون‌و زاراوە هونەری‌یەکان زانایان‌و بیرمەندان‌و فەیلەسوفەکان ناتوانن بگەنە ئەنجامە زانستی‌یەکان لەدارشتن‌و پێك هێنانی بیردۆزەو تیۆرو یاسا زانستی‌یە تایبەتی‌و گشتی‌یەکان کەپەیوەستن بەدامەزراندنی سروشت‌و ژیانەوە. هەر زانایەك بگریت جۆرە زاراوەیەکی هونەری هێما کردووەو دایتاشیوەو بەهۆیانەوە دەگاتە ئەنجامە زانستی‌یەکان کەمەبەستی بوون. زۆرجار زانایان پێك دێن

---

[٣] د. فەرەیدون عەبدول محەمەد، چەند لایەنێکی رستەسازی زاری هەورامی، لێکۆڵینەوەیەکی کارەکی‌یە، پێشکەش کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدینی کردوە، کارنامەی دکتۆرا، بلاونەکراوە، ساڵی ١٩٩٨، ل٤-٥.

لەسەر واتاو دیاریکردنی چەند زاراوەیەکی زانستی، جاری واش هەیە جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی واتای هەندێك لەو زاراوانە هەریەك بەپێی پسپۆڕیو بەپێی جۆری زانستەکە واتاکەی لەوی تر جیاوازە.

زاراوە کۆمەڵایەتی‌یەکان کەپەیوەستن بەقوتابخانەکانی بیرو هۆش‌و هزرو بیرو باوەڕەوە لەکات‌و شوێنێکی دیاریکراودا جیاوازیان هەیە، بۆیە واپێویست دەکات ئەو زاراوە زانستی‌یانە کەبەکار دەهێنرێن بۆ بابەتێکی زانستی لەلایەن لێکۆڵەرەوە دەست نیشان بکرێن. چونکە بۆ هەر یەك لەو زاراوانە چەندین واتای جیاوازو پێناسەی جیاواز هەیە، بۆ پاککردنەوەو ساغ کردنەوەی مەبەست‌و یارمەتیدانی توێژەر کەخۆی پێناسەیەکی هەنوکەیی بکات لەسەر هەریەك لەو زاراوانە کەمەبەستن.

لەم بابەتەدا گرنگترین ئەو زاراوانە کەپێویستن بناسرێن‌و خوێنەر شارەزا بێت لەڕوی ئەنترۆپۆلۆجیاو کۆمەڵناسی‌یەوە ئەمانەن(پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ژیانی کۆمەڵایەتی، هەورامان) کە لەدواوە لەڕوانگەی زانستی‌یەوە لەبەر رۆشنایی سەرچاوەکاندا هەریەکە بەجیاو بەپێی پێویست پێناسە دەکرێن بەم جۆرە:-

**١- پێکهاتەی کۆمەڵایەتی** Social Structure

باس لەپێکهاتەی کۆمەڵایەتی پەیوەستە بەڕەگ‌و ریشەی مێژووی سەرهەڵدانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە، لەڕووی دانیشتوان وژینگەو چالاکی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و رامیاری‌و شارستانێتەوە. هەروەها بەگرنگترین زاراوەکانی قوتابخانەی(پێکهاتەی-فەرمانی) دادەنرێت کەخوێندنگەیەکی گرنگی زانستی کۆمەڵناسی‌و ئەنترۆپۆلۆجیایە.

زانایـــان راو بۆچـــونی جیاوازیـــان هەیـــە لەســـەری، لـــەڕووی پێناســـە کردنیـــەوە ئەنترپۆلۆجســـتەکان تائێســـتا ڕێـــك نەکـــەوتوون لەســـەر ناساندنی، هەریەکەیان فاکتەرێك یا چەند فاکتـــەرێك بەپێکهێنـــەری ئەو زاراوەیە دەزانن.

(مۆنتسکیۆ)یەکەم کەســـە کەباســـی پێکهاتـــەی کـــردووەو دەڵـــێ: پێکهاتەی خێڵە بەربەرەکان جیاوازە لەپێکهاتـــەی بیابـــان نشـــینەکان، لەبەر هەندێك هۆکار بەرەبەرەکان ناتوانن کۆمەڵگایەکی گەورە پێـــك بهێـــنن، لەکاتێکـــدا بیابـــان نشـــینەکان کۆمەڵـــەی بچـــوکن، بـــەڵام کۆبونەتەوەو نەتەوەیەکی گەورەیان پێکهێناوە[٤]، لەناوەڕاســـتی ســـەدەی نـــۆزدەدا(Herbert Spencer) ئـــەو زاراوەیـــەی دەســـت نیشـــان کـــرد بەئاشکرا وتی: پێکهاتەی کۆمەڵگا لەپێکهاتەی بونەوەرێك دەچـــێت. دواتر(رادکلیف براون) لەساڵی ١٩٤١دا لەووتارێکیدا بەناوی لەبارەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌یەوە ڕۆڵێکی بەرچـــاوی بینیـــوە لـــەجێگیربوونو ناساندنی ئەو زاراوەیەدا.[٥]

١ بۆیە پێویستە راو بۆچـــونی چـــەند زانایـــەك لەســـەر ئـــەو زاراوەیـــە بەسەر بکەینەوە:-

(رادکلیف براون) پێکهاتەی کۆمەڵایەتی وەك پێکهاتەی پەیکەری بونەوەرێك دەناسێت، کەدرێژەدانی ژیانی هەموو بونەوەرێك لەسەر سێ کردار ڕاگیراوە ئەوانیش چالاکیو فەرمانو پێکهاتەن.

---

[٤] مونتسکیو، رۆحی یاساکان، وەرگێڕانی ئیدریس شێخ شەرەفی، هەولێر- چاپی یەکەم، ٢٠٠٣، ل٣٩٥.

[٥] رێبین رسوڵ ئیسماعیلو دیار عەزیز شەریف، ئەنترۆپۆلۆژیا، دەزگای چاپو پەخشی رێبین، ٢٠٠٤، ل٢٣٩.

بەپێی تیۆرو قوتابخانەی(پێکهاتەی- فەرمانی)، هەموو ئەندامێك فەرمانی خۆی هەیە، لەڕێی چالاکی‌یەکانییەوە پێکهاتەی پەیکەری بونەوەرەکە دروست دەبێت. وەستانی چالاکییەکان‌و بێ فەرمانی ئەندامەکان پێکهاتەی بونەوەرەکە لەکار دەکەوێت‌و دەڕوخێت‌و دەمرێت. هەروەها دەڵێت(فەرمان) ئەو پێوەندی‌یەیە کەچالاکی‌یەکان بەپێکهاتەوە دەبەستێت، بەڵام فەرمانی سستمی کۆمەڵایەتی لای(ئیمیل دورکایم) بەجۆرێکی ترە کەدەڵێت((فەرمانی سستمی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەڕێکخستنی سستمی کۆمەڵایەتی‌و پێویستی‌یەکانی بونەوەری کۆمەڵایەتی)).

(براون) لەگەڵ پێویستی‌یەکاندا Needs نی‌یەو گۆڕیونی بەمەرجە پێویستی‌یەکانی بوون. بەڵام(سبنسەرو براون) رایان وایە(فەرمان) دروستکەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌یە بەپێی تیۆرو قوتابخانەی(پێکهاتەی-فەرمانی). هەروەها(براون) بەم جۆرە پێناسەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کردووە: پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەکۆمەڵێك پەیوەندی بەیەکەوە بەستراو کە لەنێوان یەکە زۆرەکانی پێکهاتەکەدا دروست دەبن، کە لەسەر چالاکی‌یە ئاڵوگۆڕەکان دامەزراوە[٦].

کەواتە ئەم هاوکێشەیە روودەدات:

چالاکی ←——— فەرمان ←——— پێکهاتەی کۆمەڵایەتی

(احسان محمد الحسن) پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەم جۆرە پێناسە کردوە((پێکهاتەی کۆمەڵایەتی واتا ئەو پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یە

---

[٦] رادکليف براون، رائدو مؤسس علم الأجتماع والأنثروبولوجيا، ترجمة د. قباري محمد اسماعيل، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٧٧، ص٢٨١-٢٨٣.

بنچینەیی‌یانە دەگرێتەوە، کەشێوەی بنەڕەتی کۆمەڵگاو ڕێگا بەکارهاتوەکانی کارکردن دیاری دەکات)).[7] (شاکر مصطفی سلیم) پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەم جۆرە پێناسە کردوە((بریتی‌یە لەکۆمەڵێك پەیوەندی کۆمەڵایەتی، کەهەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بەیەکەوە دەبەستێتەوە لەکاتێکی دیاری کراودا)).[8]

هەروەها(ئیڤانز بریتشارد) بەم جۆرە پێناسەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کردووە((پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەپێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە هەمیشەیی‌یەکان لەژیاندا لەماوەیەکی دیاری کراودا، کەتوانای خۆپاراستنیان هەیەو دەمێننەوە وەك کۆمەڵێك، هەرچەندە ئەندامەکانیشیان توشی گۆڕان ببن)).[9]

لەلایەکی ترەوە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەم جۆرە پێناسە کراوە(پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەپەیکەری پلەو پایە کۆمەڵایەتی‌یە یەك بەدوای یەکدا هاتوە بەیەکەوە بەستراوەکان، کەهەریەکە پسپۆڕیو تایبەتمەندی ووردی خۆی هەیە کەئەوە ناگەیەنێت تاکەکان تەنها مرۆڤبن، بەڵکو پەیکەرێك پێك دەهێنن کەکۆمەڵگایان لەسەر دروست بوە، بەهەموو دامو دەزگا دامەزراوەکانی‌یەوە، ئەوەش بەئاوێتە بوونو پەیوەندی کردنو چالاکی ڕۆژانەو ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو دامەزراوەو

---

[7] د. احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع، الطبعة الاولى، دار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٩٩، ص١٢٩-١٣١.
[8] د. شاكر مصطفى سليم، قاموس الانثروبولوجيا، الطبعة الاولى، جامعة الكويت، ١٩٨١، ص٩٠٢.
[9] Evans- Pritchard, The Nuer, Oxford, 1940, P. 21.

ڕێکخراوەکان‌و کۆمەڵەکان‌و تیرەو هۆزەکانەوە دەبێت بەپێی توانا‌و بەپێی ڕوداوە مێژوویی‌یەکانی ئەو ئاوەدانی‌یە).[10]

(عبدالحمید لوتفی) بەم جۆرە پێناسەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کردوە((بریتی‌یە لەکۆمەڵێك پەیوەندی نمونەیی جێگیر لەنێوان یەکە کۆمەڵایەتی‌یەکانی کۆمەڵگادا کەدروست دەبن)).[11]

(خەلیل ئەحمەد خەلیل) بەم جۆرە پێناسەی کردوە((بریتی‌یە لەیەکگرتن‌و ڕێککەوتنی دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکان)).[12] هەروەها پێکهاتەی کۆمەڵایەتی((بریتی‌یە لەکۆمەڵێك سستم‌و بیروباوەڕو بنەما کەکۆمەڵگا هەڵیان دەسەنگێنێت‌و بڕیاریان لەسەر ئەدات بەچاك یا بەخراپ)).[13] ئەم پێناسەیە ئەوە دەگەیەنێت ئەو سستم‌و بیروباوەڕو بنەمایانەی کۆمەڵگا دەبێت لەسەرەتاوە وەك ئایدۆلۆژیایەك پەیدا ببن‌و چەند زاراوەو بیرو بۆچونێکن دوای ئەوەی کۆمەڵگا پەسەندیان دەکات دەگۆڕێن بۆ بواری کردەیی‌و لەڕێی چالاکی‌یەکان‌و جموجوڵەکانەوە هەریەکەیان ڕێکخراوێك‌و دەزگایەك پێکدەهێنن کەهەر یەکەیان فەرمانێکی هەیە لەبواری ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و رامیاری‌و فەرهەنگی‌یەوە، ئەوانەش دەبنە پێکهێنەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌ی کۆمەڵگاکان‌و نەتەوەکان.

---

[10] فهمي سليم الغزوي واخرون، المدخل الى علم الاجتماع، دار الشروق، عمان- الاردن، ١٩٩٢، ص٢٥٥.

[11] د. عبدالحميد لطفي، علم الاجتماع، دار المعارف بمصر، ١٩٧٨، ص٦١.

[12] د. خليل احمد خليل، المفاهيم الاساسية في علم الاجتماع، دارالحداثة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت- لبنان، ١٩٨٤، ص٤٥.

[13] مجموعة من اساتذة علم الاجتماع، دراسات في علم الاجتماع والانثروبولوجيا، دار المعارف بمصر، ١٩٧٥، ص٢٢٠

زانایانی تر پێناسەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌یان بەچەند جۆرێکی تر کردووە وەك(پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەو رێگایانەن کەکۆمەڵگایان دابەشکردوە بەسەر چەند دەستەو گروپێکی کۆمەڵایەتی‌دا، یا بەسەر چەند دەستەو گروپێکی جیاوازدا لەسەر بنەمای رەگەز، شوێنی جوگرافی، تەمەن، خزمایەتی، وەلەهەموو کۆمەڵگایەکدا ئەو توخمە جیاوازانە دەبنە بنچینە بۆ ئەو دابەشکردن‌و جیاوازی باڵا دەستی‌یانە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامەکانی ئەو دەستەو گروپانە بەیەکەوە بەستراونەتەوە لەخێزانەکانیاندا کەیەکێکە لەپێکهێنەرەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی).[14]

زانایەکی تری کۆمەڵناسی(تالکۆت پارسۆنز) بەم جۆرە پێناسەی دەکات((پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەسستەمی پەیوەندی‌یە ئاڵۆزە هاوشێوەکان‌و چۆنیەتی تاکەکان کە لەجیاتی یەکتر رۆڵ دەبینن‌و بەجیاوازی‌یەوە دەردەکەون)).[15] لەم پێناسەیەی پارسۆنزدا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەپێکهاتەی سستمێکی گشتی دەستنیشان دەکات‌و پەیوەندی سستمە کۆمەڵایەتی‌یەکان چۆن سستمێکی گشتی پێك دەهێنن هەر بەو چەشنەش ئەو پەیوەندیانە هەریەکە بەجیا فەرمانێکی هەیەو بەهەموویانەوە بەشێوەی جیا جیا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا دروست دەکەن.

---

[14] د. احمد ابو زيد، البناء الاجتماعي مدخل لدراسة المجتمع- الانساق، الهيئة المصرية العامة للكتاب فرع الاسكندرية، ١٩٧٩، ص٢٠٨.

[15] س. ي. بوبوف، نقد علم الاجتماع البرجوازي المعاصر، ترجمة نزار عيون السود، دار دمشق للطباعة والنشر، بدون سنة الطبع، ص٤٨.

مارکس دەڵێت((پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەچینەکانی کۆمەڵگا دروست بووە، چینێکیان کەمینەو خاوەنی هۆکانی بەرهەمهێنانو دەسەڵاتو فەرمانڕەواینو چینەکەی تر زۆرینەنو هیچیان نییەو بێ دەسەڵاتنو بەشداری ناکەن لەفەرمانڕەوایدا. واتا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پەیوەستە بەپێکهاتەی شمەکی کۆمەڵگاوە، کەسەرچاوە سروشتییەکانو مرۆییەکان سەرخانو ژێرخانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن. ئەگەر پێکهاتەی کاڵایی گۆڕرا ئەوا سەرخانیش دەگۆڕێتو پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش دەگۆڕێت)).[١٦]

هەروەها(پێکهاتە) واتای راگرتنو جێگیربوون دەگەیەنێت لەزانستی ئەندازەو خانووبەرە دروستکردندا. بەڵام زانایانی کۆمەڵناسیو ئەنترۆپۆلۆجیا کەلکیان لێوەرگرتووە کە((ئاماژە بەپێکهاتەی هەموو سستمێکی نەگۆڕو جێگیر دەدات، کە لەچەند بەشێکی بەیەکەوە بەستراو بۆ ئەنجامدانی فەرمانێك، وەئەو فەرمانە دەگۆڕێت بەگۆڕانی ئەو بەشانەی کەسستمەکەیان پێك هێناوە)).[١٧]

لەدوای بەسەر کردنەوەی بیرو بۆچوونی هەندێك لەزانایانی کۆمەڵناسیو ئەنترۆپۆلۆجیا لەسەر زاراوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ئێستا دەتوانین بڵێین: پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هەورامان بریتییە لەتۆڕێکی بەیەکەوە بەستراوی چەند یەکەیەکی جیاوازی دانیشتوان کە لەسەر بنەماکانی نشینگەو زمان پێك هاتووە.

---

[١٦] د. احسان محمد الحسن، رواد الفكر الأجتماعي، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، ١٩٩١، ص ١٥٦-١٦٣.

[١٧] معجم العلوم الأجتماعية، تصدير ومراجعة د. ابراهيم مدكور، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٥، ص٩٩.

### ٢-ژیانی کۆمەلایەتی: Social Life

ژیانی کۆمـەلایەتی هەمـوو ئەو ڕێگاو ڕێبازانە دەگرێتەوە کەتاك یان کۆمەڵ دەیانگرنە بەر بۆ دابینکـردن‌و ڕێکخسـتنی ژیـان‌و گوزەرانیـان. ئەوانـەش لەسـەردەمێکەوە بـۆ سـەردەمێکی تـر جیاوازیـان هەیـە لەسەرەتاوە ساکارو ئاسان‌و بێ گرێو گـۆڵ بـوون، وورده وورده پـەرەیان سـەندووەو قـورس‌و گـران بـوون، لەسـەرەتاوە تاکـە کـەس لەگـەڵ کۆمەڵەکەیـدا لەسـنورێکی دیـاریکراودا توانیویانـە هـەموو پێداویسـتی‌یەکانی ژیانیـان دەسـتەبەر بکـەن، بـەڵام دواتـر ژمـارەی دانیشتوان زیادی کردوەو پێویستی‌یەکان زۆر بـوون‌و کارەکـان قـورس‌و گران بوون، ئیتر وای پێویست کردووە هەر تاکێك کارێك ئـەنجام بـدات، بـەو جـۆرە پرۆسـەی(دابەشـکردنی کـار) پەیـدابووە، کۆمـەلگاکان‌و گەلەکان‌و نەتەوەکان جیاوازیان هەیـە لـەڕووی ژیـانی کۆمـەلایەتی‌یـەوە، هەنـدێکیان راوچـین‌و هەندێکیشـیان جوتیـارن هەنـدێکی تریـان پیشەسازن، هەندێکیان لەوانی تر پێشکەوتوترن.

(ئیحسـان محمـد الحسـن) دەڵـێ((ژیـانی کۆمەلایـەتی بریتی‌یـە لەشێوازی ژیان‌و ڕێبازی گوزەران‌و شـێوەی هەڵسـوکەوت‌و پەیوەندی‌یـە کۆمەلایەتی‌یەکان، کەتاکەکانی ناو کۆمـەلگا دروستی دەکەن، ئیتر ئـەو کۆمەلگایە خۆجی‌یی بێت یا کۆمەلگای گەورە)). یان بەشێوەیەکی تـر پێناسـەی کـردووەو دەڵێـت((ژیـانی کۆمەلایـەتی بریتی‌یـە لەشـێوازە ناوەکی‌یەکانی ژیانی ناوەوەی کۆمـەلگا، کەخسـلەتی تایبەتی دەبەخشـن بەکۆمەلگایەك‌و جیای دەکەنەوە لەکۆمـەلگایەکی تر)).[١٨] (احسان) بەم جـۆرە پێناسـەکەی شـی دەکاتـەوەو دەڵـێ ژیـانی کۆمـەلایـەتی لەچـەند

---

[١٨] د. احسان محمد الحسن، موسوعه علم الاجتماع، المصدر السابق، ص٢٦١.

بنەمایەك پێك دێت كەپێشەنگیان باری ئابوریو ژینگەییو تەكنەلۆژیاییو بیریو هزریو دەروونیو رۆشنبیریو ئایینیو رامیارییە، كەدەوری كۆمەڵگایان داوەو جیایان كردۆتەوەو دیارییان كردوە، هەروەها ژیانی كۆمەڵایەتی رەنگ كراوە بەدابو نەریتو خوو و رەوشتو چاولێكەریو لاسایی كردنەوەی پێشینان، كەهەڵسوكەوتی تاكەكانی كۆمەڵگایان دیاریكردوەو لەچوارچێوەیەكدا دایان رشتوەو لەكۆمەڵگاكانی تر جیاكراوەتەوە.

(حسێن فهیم) بەم جۆرە پێناسەی ژیانی كۆمەڵایەتی كردوە((ژیانی كۆمەڵایەتی هەچ كۆمەڵگایەك بگریت بەرپرسیارە لەپێكهاتەی كۆمەڵگاو پاراستنیو مانەوەی)).[19]

(ئەرستۆ) ووتویەتی((مرۆڤ ئاژەڵێكی كۆمەڵایەتییە تەنها بە لەدایكبوونی لەناو كۆمەڵگادا وا ئەكات كەپێویستییەكی رەهایی بەكۆمەڵگا هەبێت، چونكە مرۆڤایەتی سروشتی بەپەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانەوە بەستراوە تا ئەو كاتەی خەڵك بەرگەی ژیان دەگرێت)).[20] (لوسی میر) بەم جۆرە پێناسەی ژیانی كۆمەڵایەتی دەكات((بۆ دامەزراندنو پەیدابوونی هەچ كۆمەڵگایەكی مرۆڤایەتی پێویستی بەچەند سستمێكی دیاریكراو هەیە كەپەیوەندییە كۆمەڵایەتییە سەرەكییەكان رێك دەخات لەژیانی كۆمەڵگادا)).[21]

---

[19] د. حسين فهيم، قصة الأنثروبولوجيا، مجلة عالم المعرفة، العدد ٩٨، كريت، ١٩٨٦، ص١٦٨.

[20] ر. م. ماكيڤر وشالز هـ. پيدج، المجتمع، ترجمة د. علي أحمد عيسى، الجزء الأول، مكتبة النهضة المصرية، ١٩٧٤، ص٢٢.

[21] لوسي مير، مقدمة في الأنثروبولوجيا الأجتماعية، ترجمة د. شاكر مصطفى سليم، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، الجمهورية العراقية، ١٩٨٣، ص٢٩٢

(بەدرخان سندی) بەم جۆرە پێناسەی ژیانی کۆمەڵایەتی کردووە((ژیانی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەگەشەکردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لەلای مرۆڤو کاریگەریی ئەو گەشەکردنە لەدارشتنی شێوەی ژیان لەناو کۆمەڵە مرۆڤەکاندا)).[٢٢]

(هادی رشید چاوشلی) بەم جۆرە پێناسەی ژیانی کۆمەڵایەتی کردووە((ژیانی کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لەداب‌و نەریت‌و بنەما رەوشتی‌یە باوەکانی ناو کۆمەڵگا)).[٢٣]

دوای خستنە رووی پێناسەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەڕای زانایانی ئەنترۆپۆلۆجیاو کۆمەڵناسی ئەتوانین بڵێین: ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هەورامان بریتی‌یە لەهەموو چالاکی‌یە مرۆیی‌یەکان‌و پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان، کە لەژینگەکەدا دروست بوون، لەبەر پێویستی سستمێکیان پێکهێناوە کەئەرك‌و مافەکانی تاك‌و کۆمەڵگاکەی رێك خستووە لەچوارچێوەی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانداو هەمیشە لەگۆڕاندایە.

**٣- هەورامان:** Hawraman

تا ئێستا لێکۆڵەرەوان‌و زانایان‌و مێژوو نوسان رێکنەکەوتون لەسەر دەستنیشانکردنی واتای زاراوەی(هەورامان)، راوبۆچوونی جیاواز هەیە لەناساندنیدا چ لەرووی زارەکی‌یەوە بێت یا لەرووی واتایی‌یەوە. بۆیە واپێویست دەکات بەدرێژی راوبۆچونەکان بخرێنەروو. سەرەتا پێویستە

---

[٢٢] د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور الأستشراقي، دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٢، ص٤٥.

[٢٣] هادي رشيد جاوشلي، الحياة الأجتماعية في كردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٧٠، ص٧١.

زاراوەی هەورامان شێوەی نووسینو ئاخافتنو زارەکییەکەی نیشان بدەین بەم جۆرە:-

زاراوەی هەورامان بەم شێوانە بەکارهاتووە:

Avroman[24] , Awraman[25]، ئورۆمۆن[٢٦]، ئورامان[٢٧]، ئورامی[٢٨]، أرمان[٢٩]، ئەورامن.[٣٠]

**واتای زاراوەی هەورامان:-** ئەم زاراوەیە(سەرزەمین، ئاتشکدە، ئاورامان)[٣١] یاخود واتای(مەڵبەندێکی شاخاوی چڕە، خەڵکی هەورامان، شێوەی کوردی هەورامان)[٣٢] دەگەیەنێت.

لەهەندێك سەرچاوەی تردا واتای زاراوەی هەورامان بەجۆرێکی تر لێك دراوەتەوە کەبەم جۆرە دەیانخەینە بەر چاو:- بۆچونی(محەمەد ئەمین هەورامانی) لەسەر زاراوەی(هەورامان) واتای جێگای خۆشاردنەوەو

---

[24] محمد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، انتشارات بلخ، تهران، ٢٠٠٠، ل بەرگی کۆتایی.

[25] D. N. M ackenzie . The Dialect of Awraman . London, 1966, P 5-6.
یان د. ئەورەحمانی حاجی مارف، چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نوسراوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد- ١٩٧٤، ل٦٥.

[٢٦] دیوانی صەیدی، کۆکردنەوەی محمد امین کاردۆخی، چاپخانەی کامەرانی سلێمانی، ١٩٧١، ل١٣.

[٢٧] صدیق بۆرەکەیی، فەرهەنگی بۆرەکەیی، انتشارات پلکان، چاپی یەکەم، ٢٠٠٢، ل١٠٧٦.

[٢٨] محمد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

[٢٩] محەمەد ئەمین زکی، تأریخی سلێمانی وولاتی، چاپخانەی النجاح، بغداد، ١٩٣٩، ل٢، پەراوێزی ژمارە٢.

[٣٠] محمد ئەمین هەورامانی، سەرچاوەی سەرەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠٦.

[٣١] صدیق بۆرەکەیی، فەرهەنگی بۆرەکەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧٦.

[٣٢] عبدالرحمان شرفکندی(هەژار)، فەرهەنگی هەمبانە بۆرینە، چاپخانەی سروش، تهران، ساڵی ٢٠٠٣، ل١٠٠٩.

خۆپاراستنی پیساوە ئاینیەکانی ئاینی زەردەشت بووە، کە بەناوی(ئاهورامەزدا) وە ناسراوەو دواتر گۆڕان بەسەر زاراوەی(ئاهورامەزدایەدا) هاتووەو بوە بەزاراوەی(هەورامان). هەروەها چەند بۆچونێکی کسانی تریشی تۆمارکردوون کەخۆی باوەڕی پێیان نی‌یە وەك هەورامان لەووشەی(رمان)ی عەرەبیەوە وەرگیراوە. یا لەووشەی(ئاورامان) بەواتای(برسێتی-برسیمان) وەرگیراوە. یا بەواتای(هۆرئامان-هەڵهاتن)وەرگیراوە. یا بەواتای(ئاور-ئاگر) وەرگیراوە. یا بەواتای ناوی زیندانێکی ئەسکەندەری مەکەدۆنی کەناوی(ئەورامن) بوو ئەو ناوەی لێنراوەو دواتر بۆتە(هەورامان).[٣٣]

هەروەها چەند راوو بۆچونێکی تر خراونەتە روو دەربارەی زاراوەی(هەورامان) بەم جۆرە:-

هەورامان لە(زادەگای هەورەکانەوە) هاتووە بەواتای شوێنی پەیدابوونی هەورەکان. هەورامان لە(هۆرئامایی)یەوە هاتووە ئەمەش واتای هەورازو سەرەوژوور دەگەیەنێ. هەورامان لە(هۆرئامان یا وەرئامان)ەوە وەرگیراوە کەشوێنی هەڵهاتنو دەرکەوتنی خۆر دەگەیەنێت. هەورامان لە(ئۆمەران)ەوە هاتووە کەیەکێك بووە لەئاهەنگەکانی پێش ئیسلام. هەورامان لەدووبەش پێکدێت(ئۆرا) واتا قەڵای قایمو سەخت، (مانا)ی نیشتگە دەگەیەنێ بەو شێوەیە هەردوو بەشەکە دەبن بەقەڵای قایمو سەخت. هەورامان لەسەرەتادا(ئاهورامەزندان) بووە، پاشان ئاهورا گۆڕاوە بۆ(هورا)و(مەزندان)یش گۆڕاوە بۆ(مان)، بەو شێوەیە زاراوەکە بەسەر

---

[٣٣] محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرچاوەی سەرەوە، ل٦٠٨-٦٠٩.

یەکەوە بووە بە(هەورامان). هەورامان لە(ئاورامان) یا (ئازەرمان)ەوە هاتووە بەمانای کوانوو یا ماڵی ئاگر.[٣٤]

هەروەها ئەم بۆچوونانە لەبارەی واتای هەورامانەوە خراونەتە روو، (ئورامەن) واتا جۆرە گفتوگۆیەکی شیعریەو شیعرەکان بەزمانی پەهلەوی نوسراون. هەورامان لە(ئەورامەن)ەوە هاتووە کەیەکێکە لەئاهەنگە مۆزیکیە کۆنەکانی فارسەکان. هەروەها ناوی(هەورامی) لە(ئاهورایی)یەوە هاتووە، سەرەتا ناوەکە(ئورا)بووە وەك کورتکراوەیەکی ناوی (ئاهورا)، هەورامانیش واتای شوێنی نیشتەجێبوونی ئاهوراییەکان دەگەیەنێ[٣٥].

لەکەنارەکانی گۆمی(ئۆرامیە-ئورومیە) تیرەیەك لەنەتەوەی مادەکانی تێدا ژیاونو پێیان وتراوە(ئەورامی)، ئەمڕۆ پێیان دەوترێ(هەورامی، هەورامانی).(هەورامان-ئەڤرومان) لەووشەی(رمان)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. هەورامان لە(ئاهورامەزدامان)ەوە وەرگیراوە، ناوەکە کورتکراوەتەوە(ئاهورا) بووە بە(هورا)و (مەزدامان) بووە بە(مان) بەسەریەکەوە بووە بەهەورامان. هەورامان مانای( هەڵتۆقینو بەرزبونەوە) دەگەیەنێت.

(هادی رەشید بەهمەنی) چەند بۆچونێکی خستۆتە روو دەربارەی واتای زاراوەی هەورامان بەم جۆرە:- ریشەی(ئاهورامازدا) لەووشەی هەوراماندا بەسۆرانی ئەبێتە هەورامان. هەورامان لەووشەی(هەورام)ەوە

---

[٣٤] عبدالله کریم محمود ئەیوب روستم، هەورامان سروشتی جوانیو کەلتوری کوردەواری، رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ١٧٨٤، ساڵی ١٩٩٩، سلێمانی، ل٧.

[٣٥] ئەیوب روستم، پەرتوکی هەورامان، مەڵبەندی رۆشنبیری هەورامان، چاپی یەکەم، بێ چاپخانە، ٢٠٠٤، ل٨-١٨.

وەرگیراوە کەبرای(کەندوول) بووە، هەردوکیان هاتونەتە ناوچەکەو ئاوەدانیان کردۆتەوەو بەناوی یەکێکیانەوە کە(هەورام)ە ئەو ناوەی لێنراوە. هەورامان چەند واتایەك دەبەخشێت ووشەیەکی جیناسە بەواتای(بەرزبوەوە، هەڵتۆقیوو، هەڵهاتوو، راکردوو، هەلکەنراو لەجێی یەك، هەورهاتوو).[36]

(کەریم زەند) چەندین واتای بۆ زاراوەی هەورامان دەستنیشان کردون وەك:-

هەورامان واتا(بەرزی دەڤەر)یا(هورئامای)یا(هاتنە سەرەوە)یا(ئاوساو)یا(ماڵ ویانەو شوێن) یا بەواتا(هەورەکان). هەروەها کەریم زەند ئەم بۆچونانەی تریشی بۆ واتای هەورامان تۆمار کردوون(هەورامان واتا(خۆرئامان)، یا بەواتا(خاوەر) یا بەواتا(خۆرهەڵات). لەلایەکی ترەوە رای وایە(ئورامان) واتا ئاهەنگی کۆنی کوردە. هەروەها دەڵێ(ئوورا) واتا(دوژ)یا(قەڵاو شورای سەخت).(ئاورامان) واتا(برسێتی).(ئاورمان-ئوورامان-ئازەرمان) واتا ئاگرگە یا ماڵی ئاگر))[37].

ئەو هەموو راو بۆچونانە بۆ واتای زاراوەی(هەورامان) کەخرانە روو هەندێکیان جێی گومانن، هەندێکیان زۆر دوورن لەراستییەوە، هەندێکیشیان لەراستییەوە نزیکن بەبۆچونی شارەزایانی خەڵکی ناوچەکەو لەبەر رۆشنایی سەرچاوە مێژوویی یەکانداو ئێمەش وەك توێژەر هەر رای ئەوانەمان لاپەسەندە.

---

[36] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، چاپخانەی ژین، هەولێر ٢٠٠١، ل٢١٤.
[37] کەریم زەند، هەورامانناسی، گۆڤاری سورێن، مەکتەبی راگەیاندنی حزبی سۆسیالیست، سلێمانی، ٢٠٠١، ژمارە ٨٨، ل٥.

بۆیە وا پێویست دەکات بۆ دیاری کردنی واتای زاراوەی هەورامان پشت بەدوو سەرچاوەیان ببەستین کەجێی باوەڕپێکردنن ئەوانیش ئەمانەن:-

سەرچاوەی یەکەم جەماوەرو خەڵکی ناوچەکە.

سەرچاوەی دووەم سەرچاوە مێژووییەکانن. لەوە زیاتر راکانی تر جێی گومانن چونکە هیچ بەڵگەیەکی زانستییان نییە کەبۆچونەکانیان بسەلمێنێت.

رای خەڵکی هەورامان لەسەر واتای زاراوەی هەورامان= هورئامان واتا(جیاکراوە، هەڵچوو، هەڵتۆقین- هەڵی هێناوە) تا ئێستا لەئاخافتنی شێوەزاری هەورامیدا لەناو خەڵکەکەدا واتای ئەمانە زیندووەو رۆژانە بەکار دەهێنرێت. بۆ نمونە: خەڵکەکە دەڵێت(شۆتەکە هورئامان= شیرەکە هەڵچووە یا بەرز بوەتەوە). (جوجەڵەکێش هۆر ئاردێنێ= جوجکەکانی هەڵهێناوە). (گەلەکە هورئامان= رانە مەڕەکە جیا بوەتەوە).

پێناسەی زاراوەی هەورامان بەپێی سەرچاوەی یەکەم کەخەڵکی هەورامان بوو واتا(سروشتێکی جوگرافی جیاکراوەو کۆمەڵگایەکی جیاکراوەو شێوەزارێکی جیاکراوە دەگەیەنێت).

بەپێی دووەم سەرچاوە کەسەرچاوە مێژوویی یە کۆنەکانن واتای(زاراوەی هەورامان هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی ئایینی زەردەشت باوەڕی بەخوای(ئاهورامازدا) هەبووە، مەڵبەندی هەورامانی ئێستاش بەپێی بوونی ژمارەیەکی زۆری(ئاتەشگا)کان لەو ناوچەیەداو بەپێی پەیڕەوکردنو مانەوەی هەندێك لەدابو نەریتو خوو ڕەوشتی ئایینی زەردەشت لەناو کۆمەڵگاکەدا، دەبێت کاریگەری ئەو بیروباوەڕە

ئاییني‌یه زۆر بوبێت لەسەریان ناوی مەڵبەندەکەیان بەناوی خواکەیانەوە ناو نابێت‌و دواتر گۆڕابێت بەهەورامان). چونکە بەلابردنی(ئا)ی پێشەوەی زاراوەکەو، (دا)ی کۆتایی زاراوەکە کە(ئاهورامازدایە)و گۆڕینی پیتی(ز) بەپیتی(ن) راستەو راست زاراوەی(هەورامان) بەدەستەوە ئەدات، وەك لەم هاوکێشەیەدا دەردەکەوێت:

ئاهورامازدا ⟵ ئا(هوراماز)دا ⟵ هورامان.[٣٨]

لەبەر رۆشنایی‌ی ئەو سەرچاوانە دەتوانین واتای هەورامان دیاری بکەین‌و بلێین(ئەگەر نەتوانین هەورامان بەرەسەنی گەلی کورد بناسێنین، بێگومان دەتوانین بڵێین هەورامان بەشێکە لەپێکهاتەی خاکی کوردستان‌و گەلی کوردو زمانی کوردی، بەشوێنی نیشتەجێ بونیان‌و شێوەزارەکەیان خاکی کوردستانیان فراوان کردوەو زمانی کوردیان دەوڵەمەند کردوەو پێناسی خۆیان نیشان داوەو پێ‌ی دەناسرێنەوە)

دوای رونکردنەوەی واتاکانی(زاراوەی هەورامان) هەروەها دوای پێناسەکردنی زاراوەی هەورامان بۆ زیاتر شارەزا بوون لەجوگرافیای هەورامان‌و شێوەزاری هەورامی‌و مێژووی هەورامان لەبەر رۆشنایی سەرچاوەکاندا لەدواوە دەخەینە روو.

ج-جوگرافیای هەورامان

١-روبەری هەورامان:- بەگشتی روی زەوی هەورامان سەخت‌و شاخاوی‌یە، هەڵکەوتەکەی شێوە سێگۆشەیی‌یە، سێ پارێزگای کوردستان بەیەکەوە دەبەستێت(سلێمانی لەعیراق‌و کرماشان‌و سنە لەئێران) زنجیرە چیای زاگرۆس بەسروشتی بەشی کردووە بۆ هەورامانی رۆژهەڵات(هەورامانی تەخت)و هەورامانی رۆژئاوا(هەورامانی لهۆن)

---

[٣٨] محمد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠٩.

لەرووبەریکی ٢٥٠٠-٣٥٠٠کم٢.[٣٩] یا لەرووبەریکی ١٠٣٢٠کم٢دا.[٤٠] کەوتۆتە رۆژهەڵاتی پاریزگای سلیمانی عیراقو رۆژئاوای دوو پاریزگاکەی ئیران. لەپەیمانی زەهاوی ١٦٣٩ز لەنیوان دەوڵەتی سەفەوی-ئیرانو دەوڵەتی عوسمانی- تورکیادا دابەش کرا، بەشی زۆری(هەورامان) بەر دەوڵەتی سەفەوی کەوت، بەشیکی هەورامانی لهۆن بەر دەوڵەتی عوسمانی کەوت، کەئیستا بەشیکە لەحکومەتی هەریمی کوردستانی عیراق.[٤١] لەساڵی ١٧٨٥دا(سان)[٤٢]ـە.

دەسەڵاتدارەکانی هەورامان جاریکی تر دابەشیان کردووەو کردیان بەپینج بەشەوە بەناوی هەورامانەکانی(لهۆن، تەخت، دزڵیو شامیان، رەزاو وکەمەرە، ژاوەرۆو گاوەرۆ)[٤٣].

ئەم کارنامەیە لەسەر هەورامانی لهۆن بەشی حکومەتی هەریمی کوردستانی عیراق ئەنجام دراوە کەلەم شارۆچکەو لادییانە پیك هاتووە(تەویڵە، بیارە، ئیلان پێ، هانەی قوڵ، زەڵم، ئەحمەدئاوا، هانەی

---

[٣٩] فیروز حسن، گۆڤاری هەورامان، مەڵبەندی رۆشنبیری هەورامان، ژمارە١، بێ چاپخانە، سلیمانی، ٢٠٠٣، ل٥.

[٤٠] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پیشوو، ل٢٤١.

[٤١] کەریم زەند، هەورامانناسی، گۆڤاری سورین، سەرچاوەی پیشوو، ل٩.

[٤٢] سان:- دەسەڵاتداری دنیاییەو فەرمانرەوای ناوچەیەکی کردووە لەسەردەمیکی میژووییدا لەهەوراماندا. ئەو زاراوەیە هەندیك رایان وایە لە(ساتراب)ـەوە وەرگیراوە، بروانە ئی. م. دیاکۆنۆف، میدیا، وەرگیرانی برهان قانع، ل٤٧٣-٤٧٩. کاتی خۆی وولاتی ئیران ٢١ ساتراب بووە زاراوەی(سان) لەو ساترابەوە وەرگیراوە هەندیکی تر رایان وایە لە(سلطان)ی عەرەبیەوە وەرگیراوە، بروانە تەیوب رۆستەم، هەورامان، سەرچاوەی پیشوو، ل٢٦.

[٤٣] بەهرام وەلەدبەگی، هەورامان، گۆڤاری ئاوینە ژمارە(١٥-١٦)، تاران، ١٣٧٤ ئیرانی، ل٨٢.

دن، سـەرگەت، دەرەی مـەڕ، گەچـینە، باخـەکۆن، گۆلـپ، نارنجلـە، بنجەودڕێ، زەردەهاڵ، خارگێلان، خەرپانی، دەرەقەیسەر، دەگا شێخان، بەڵخە، سۆسەکان، پالانیا).

(ڕەشاد میران) گوندەکانی(هاوار، چالان، دەرەتوێ)ی لەسەر هەورامان لەقەڵەم داوە.[٤٤] بەڵام لەڕاستیدا ئەو گوندانە دراوسێی هەورامانی لهۆنی بەشی کوردستانی عێراقن لەلای باشوری ڕۆژهەڵاتەوە. تێکڕا ژمارەی شارۆچکەو لادێکانی سنوری لێکۆڵینەوەی ئەم کارنامەیە(٢٢) شارۆچکەو لادێیە. بەڵام تا ئێستا(٧) لادێیان ئاوەدان نەکراونەتەوە کەئەمانەن(گەچینە، باخەکۆن، گۆلپ، خەرپانی، دەرەقەیسەر، پالانیا، بنجەودڕێ). هەروەها ئەم دوو گوندەش( هانەی قوڵ، ئێلان پێ) ژمارەیان کەمە هانەی قوڵ ٣خێزانو ئێلان پێ ٤خێزانن. کە لەڕوبەرێکی ١٠٤٢٧١کم٢[٤٥] دروست کراون.[٤٦]

٢-ژمارەی دانیشتوانی هەورامان:

کۆمەڵێك سەرچاوە ئاماژەیان بەژمارەی دانیشتوانی هەموو هەورامان کردوە. لە چلەکاندا محەمەد ئەمین زەکی ژمارەی دانیشتوانی هەورامانی بە٤٠٠٠ کەس خەمڵاندو[٤٧] پاش نزیکەی نیو سەدە لەو خەمڵاندنە هادی ڕەشید بەهمەنی ژمارەی دانیشتوانی هەورامانی گەیاندە ١٠٥٥٠٠٠ کەس.[٤٨]

---

[٤٤] د. ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینیو نەتەوەیی لەکوردستاندا، سەنتەری برایەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ساڵی ٢٠٠٠، ل١٥٣.

[٤٥] سەیری پاشکۆی(٦) بکە.

[٤٦] بەڕێوەبەرێتی ناحیەی بیارەو ناحیەی خورماڵ، تۆمارە بڵاونەکراوەکان.

[٤٧] محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٢٤٠.

[٤٨] هادی ڕەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤١.

ژمارەی دانیشتوانی سنوری ئەم توێژینەوەیە(٧٠٢٦) کەسە کە لە(١٥٠٢) خێزان پێك هاتووە بەپێی تازەترین سەرژمێری کە لە٢٠٠٥دا بەڕێوەبەرێتی هەردوو ناحیەی(بیارە، خورماڵ) لەهەوراماندا ئەنجامیان داوە بۆ مەبەستی دەنگدانو هەڵبژاردن.[٤٩]

٣-نشینگەی هەورامان:-

جێی نیشتەجێ بونی هەورامیەکان(شارۆچکە نشینو دێنشینو لادێ نشین)ن، تێکڕا ژمارەی شارۆچکەو دێو لادێی هەورامان(١٤٣)[٥٠]، یا(٣٥٠-٤٥٠)[٥١]، کەدابەش بوون بەسەر(٤-٥) هەزار ماڵدا. سنوری ئەم توێژینەوەیە دوو شارۆچکە(بیارەو تەوێڵە)و (١١) دێو لادێ دەگرێتەوە لەهەورامانی(لهۆن) بەشی کوردستانی عێراق. کەئێستا شوێنی نیشتەجێ بونی خەڵکی هەورامانن بەپێی تازەترین سەر ژمێری هەردوو ناحیەی بیارەو خورماڵ.

بەڕای توێژەر جیاوازیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێت لەژمارەی دانیشتوانو ژمارەی ئەو گوندانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێ کراوە لەسەرچاوەکانەوە وەرگیراون ئەو جیاوازیانە دەبێت بۆ ئەم هۆکارانە بگەڕێتەوە:-

١-حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بۆ مەبەستی سیاسی راستیەکانیان بەدەستەوە نەداوەو زانیاریەکانیان بەتێرو تەسەلی نەخستۆتە روو.

---

[٤٩] بەڕێوەبەرێتی ناحیەی بیارەو ناحیەی خورماڵ، تۆمارە بڵاونەکراوەکان.

[٥٠] بەهرام وەڵەدبەگی، هەورامان، هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕەی پێشوو.

[٥١] رەشید هەورامی، هەڵاڵە برایەی هەورامان، چاپخانەی راپەڕین، سلێمانی، ١٩٧١، ل٣.

٢-هەندێك لەنوسەرەكان كەوتونەتە بەر كارلێكردنی لایەنگیری بێ لایەن نەبوون لەنوسینەكانیاندا.

٣-هەندێك لەنوسەرەكان شارەزا نەبون و بەمەیدانی زانیاریەكانیان كۆنەكردۆتەوە.

٤- دوور نی‌یە نوسەرەكان مەبەستی تایبەتی‌یان نەبوبێت لەخستنە روی زانیاری‌یەكانیانداو تۆماركردنیان دا.

٥- دوور نی‌یە روداوە رامیاری‌یەكانی كوردستان نەبوبنە هۆی ئەو جیاوازیانەی زانیاریەكان كە لەسەرچاوەكاندا دەركەوتون.

### ٤-ژینگەی هەورامان.

**ژینگە :** Environment Ecology[52]

ژینگە مەبەست لەكاریگەری كۆمەڵێك فاكتەری سروشتی و كۆمەڵایەتی‌یە، كەكار لەمرۆڤ دەكەن و راستەوخۆ كاردەكاتە سەر هەڵس وكەوت و هەموو چالاكی‌یەكانی. مرۆڤ دەتوانێت خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێت و خۆی رابێنێت. ژینگەیەك لەیەكێكی تر جیاوازەو هەمیشەش لەگۆڕاندایە، ژینگە كار دەكاتە سەر دروست

---

[٥٢] یەكەم جار لەزانستی بایەلۆجیدا لەسەر دەستی زانای ئەڵمانی(هیگڵ) لەساڵی١٨٦٩ ئاماژە بەووشەی ئایكۆلۆجی كراوە، كەواتای پەیوەندی‌یە ئاڵوگۆڕەكان دەگەیەنێت لەنێوان رووەك و ئاژەڵدا پەیدا دەبێت لەژینگەیەكی سروشتی دیاریكراودا، دواتر لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا وەك زاراوەیەكی زانستە مرۆڤایەتی‌یەكان لەلایەن(تشارلس چالپن Charles Galpin)ی ئەمریكایی‌یەوە بەكارهات. كەواتای پەیوەندی‌یە ئاڵوگۆڕەكانی نێوان مرۆڤ و ژینگە دەگەیەنێت. بۆ زانیاری زیاتر سەیری سەرچاوەی د. أحمد أبوزيد/ البناء الاجتماعي مدخل لدراسة المجتمع(الأنساق) ط٣/الأسكندرية/ ١٩٧٩/ ص١١. یان الدكتور علاءالدين جاسم البياتي، البناء الأجتماعي والتغيير في المجتمع الريفي، مؤسسة الاعلمي- دار التربية، بيروت- بغداد، ١٩٧٥، ص٢٣-٢٤.

بونو گۆڕانی شارستانەتەکان، شارستانەتیش کاردەکاتە سەر ژینگە. لەڕوی کۆمەلآیەتی‌یەوە مەبەست لەهەلسوکەوتی تاکەکانی مرۆڤە کە لەژیانی رۆژانەیاندا ئاوێتە بەیەکتر دەبنو چالاکی‌یەکانیان ئەنجام ئەدەن[53].

مەبەست لەئایکۆلۆجی پەیوەندی‌یەکانی نێوان مرۆڤو سروشتو بونەوەرەکانی ترە. ئایکۆلۆجی‌ی کۆمەلآیەتی تەنها بەوەلآمدانەوەی ژینگەوە نەوەستاوە کە لەئەنجامی پەیوەندی کردنو بەیەکتر گەیشتنو هەلسوکەوت کردن لەژینگەیەکدا پەیدا دەبێت، بەلکو گرنگیش ئەدا بەپێکهاتەو دابەشکردنی ئەركو فەرمانەکانی ناو کۆمەلەکانو لەگەل باسکردنی پەیوەندی‌یە راستەوخۆکانو نا راستەوخۆکان کە لەنێوان ئەندامانی یەك کۆمەلدا پەیدا دەبن لەگەل کۆمەلەکانی تردا. جگەلەوە گرنگی ئەدا بەدابو نەریت بۆ دابینکردنی هەلسوکەوتی کۆمەلآیەتی لای تاکەکانی کۆمەلگا[54].

مەبەست لەئایکۆلۆجی کۆمەلگا بەگشتی پەیوەندی نێوان مرۆڤو ژینگەیە وە لەو پەیوەندی‌یە سستمی تایبەت پەیدا دەبێت جموجولو هەلسوکەوتی خەلك بەیەکەوە دەبەستێت[55]. هەروەها ژینگەو کلتور پەیوەندیان بەیەکەوە هەیەو کار لەیەکتر دەکەن[56]. کۆمەلگای هەورامان ژینگەیەکی سروشتو کۆمەلآیەتی تایبەتی هەیە، پەیوەندی‌یەکی ئالوگۆڕ لەنێوان ژینگەی سروشتیو ژینگەی

---

[53] د. شاكر مصطفى سليم، قاموس الأنثروبولوجيا، مصدر سابق، ص٣٠٥.

[54] د. احسان محمد الحسن، موسوعة علم الأجتماع، مصدر سابق، ص١١٢.

[55] نورالدين محمد سعيد، التحديث في اسرة قوش تبه، رسالة ماجستير منشورة مقدمة الى كلية الآداب جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص٨٦.

[56] M.M.Fattah. Sociological Texts and Concepts .Ministry of Higher Education .University of Salahadin Press .P.60.

کۆمەڵایەتیدا هەیە کەیەك کار لەوی تر دەکاتو کلتوری هەورامانی لێ پەیدا بووە کەتایبەتە بەکۆمەڵگای هەورامان.

## ژینگەی سروشتیی هەورامان

هەورامان بەگشتی ناوچەیەکی شاخاویی سەختە، رواڵەتە سروشتییەکانی تایبەتن بەژینگە سروشتییەکەیەوە، کەئەویش پێکهاتەی بەرزونزمی رووی زەویەکەیی و سەختی ئاوو هەواکەیو چڕی رووەکە خۆڕسکەکەیو فرەیی سەرچاوە ئاوییەکانیو هەمەجۆری ئاژەڵو باڵندە کێوییەکانیەتی، کەیەك لەگەڵ ئەوی تردا پەیوەندی هەیەو کار لەیەکتری دەکەن، بۆ رەخساندنی ژینگەیەکی تایبەت کەهەمووپێکەوە بگونجێنو هەڵکەن، تا ژیانێکی هەمەرەنگی سروشتی جوان دەستەبەر بکەن. بەرزی ناوچەی هەورامان نزیکەی(٧٠٠-٣٠٠٠)مەترە[٥٧] لەئاست رووی دەریاوە، تێکڕای بەرزیەکەی(٢٥٤٨) مەترە لەئاست روی دەریاوە[٥٨]. ئاووهەوای هەورامان لەزستاندا بەفروبارانێکی زۆری لێ دەبارێتو ساردە، بەهاویندا فێنكو مام ناوەندە، ئەو دوو وەرزەی لەساڵدا درێژن دوو وەرزەکەی تری(بەهارو پایز) ئاوو هەوایان مام ناوەندەو باراناوین، هەورامان کەوتۆتە ناوچەی بارانی مسۆگەرەوەو ساڵانە تێکڕای بڕی باران بارینی لە(٦٠٠ ملم) کەمتر نییە[٥٩] وە کەوتۆتە ناو بازنەکانی پانی ٣٥ پلەو هێڵی درێژی ٤٥-٤٦ پلە[٦٠].

---

[٥٧] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤١.
[٥٨] د. شاکر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحي الطبيعية والبشرية، مطبعة الشفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٢٦
[٥٩] عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٥.
[٦٠] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦.

ژینگەی سروشتی هەورامان بەچەشنێك هەڵکەوتووە کەژیانی سروشتی بەشێکی زۆری بونەوەرەکان مسۆگەر دەکات بەبێ کێشەو گیروگرفت، هەر ئەوەشە بۆتە سەنگی مەحەك بۆ پەیدابوونی کلتورێکی تایبەتمەند لەناوچەکەدا، کەژینگەیەکی کۆمەلایەتی شیاو بەو ژینگە سروشتییە پەیدابێت و خەسڵەتی کۆمەڵگایەکی داخراو وەربگرێت ئەگەر لەدنیای دەرەوەش دابڕێت یەکی نەکەوێت.[٦١]

## ژینگەی کۆمەلایەتی

ژینگەی کۆمەلایەتی بریتییە لەتۆڕێکی چنراو لەپەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان.[٦٢]، وە هەموو دیاردەکانی ژیانی کۆمەلایەتی مرۆڤ دەگرێتەوە.[٦٣]، بۆیە هەموو کۆمەڵگایەکی خۆجێیی ئەندامەکانی هەست دەکەن بەیەکەوە گرێ دراون هەرچەند جیاوازیش هەبێت لەنێوانیاندا.[٦٤] هەروەها جیاوازیی رەگەزی پەیدا دەبێت لەناو خەڵکدا، چونکە ئەو کۆمەڵە مرۆڤایەتییانە ماوەیەکی دووروودرێژ بەهۆی کاریگەری ناوەندە جوگرافییە تایبەتییەکەیانەوە دابڕاون.[٦٥]

(مرۆڤ لەژینگەکەیدا بۆ ژیان و گوزەران و تێرکردنی ئارەزووەکانی هەوڵ ئەداو کار ئەکات تاکو رەوشت و هەڵسوکەوتی رێکخات لەگەڵ

---

[٦١] مارتن ڤان برونسن، ئاغاو شێخو دەوڵەت، وەرگێڕانی کوردۆ، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٥٢.

[٦٢] هادي رشيد جارشلي، الحياة الاجتماعية في كردستان، المصدر السابق، ص٤٩.

[٦٣] د. قيس النوري، ما الأنثروبولوجيا، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد، ١٩٨٦، ص٨.

[٦٤] ر. م. ماكيفرو شارلز. ڤيدج، المجتمع، ترجمة دكتور السيد محمد العزاوي واخرون، الجزء الثاني، مكتبة النهضة المصرية، ١٩٧١، ص٥٦٧.

[٦٥] د. جمال رشيد أحمد، ظهور الكرد في التأريخ، مجلة كاروان، العدد ٦٨، دار الحرية للطباعة والنشر- بغداد، ١٩٨٨، ص١٣٧.

هەڵوێستەکانیدا کەژیانی کۆمەڵایەتی سەپاندویەتی بەسەریدا).[٦٦] (تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤ کەپێکەوە هەڵسوکەوت دەکەن لەژیانی رۆژانەیانداو لەرێگەی جموجوڵە کۆمەڵایەتی‌یەکانیانەوە ژینگەی کۆمەڵایەتی تایبەتی پێکدێنن).[٦٧] (هەروەها کۆمەڵگا دەبێتە گۆڕەپانی جموجوڵی تاکەکان، کەسیستمێكو هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتی پێکدێنن کەبڕیاردەر دەبێت بۆ دیاریکردنی شێوەی ژیانی تاك لەناو کۆمەڵگاکەیدا، ژینگەی کۆمەڵایەتی تەواوکەری ژینگەی سروشتی‌یە، لەژیانی مرۆڤایەتی‌دا).[٦٨]

لەژینگەی کۆمەڵایەتی هەوراماندا (خەڵکی هەورامان لەگەڵ ئەو کوردانەی دەوروبەریان زمانیان جیایەو جلو بەرگیان جیایە).[٦٩] هەروەها (خانوو دروستکردن لەهەوراماندا تایبەتمەندی خۆی هەیەو جیاوازە لەچەشنی خانووەکانی کوردستانی عێراق).[٧٠] هەروەها (ئەو هەورامیانە لەناوچەیەکی کێوو شاخی رژدو سەختدا دەژین کە لەهەموو لایەکەوە دیواری بەرزی سروشتی دەوری داوەو تەرتیبی ژیانیشیان وەك نیشتمانەکەیان لەچاو خەڵك شتێکی ترە).[٧١] کەواتە

---

[٦٦] عبد الستار طاهر شريف، المجتمع الكردي، من منشورات جمعية الثقافة الكردية، ١٩٨١، ص٦.

[٦٧] د. شاكر مصطفى سليم، قاموس الأنثروبولوجيا، المصدر السابق، ص٣٠٥.

[٦٨] هەمان سەرچاوە، ل٨٩٦.

[٦٩] أ. م. مینتیشاشفیلی، کورد، وەرگێڕانی دکتور عیزەدین مستەفا رەسول، وەزارەتی رۆشنبیری- سلێمانی-١٩٩٦، ل١٤٨.

[٧٠] محمد مصطفى أحمد، بيارة، دراسة سوسيو أنثروبولوجية، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب، ١٩٩٤، ص٣٧.

[٧١] واسیلی نیکتن، کوردو کوردستان، وەرگێڕانی خالیدی حسامی (هێدی)، کتێبخانەی نیشتمانی هەرێمی کوردستان، هەولێر، ١٩٩٨، ل٤٩٣.

خەڵکی هەورامان ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتیان بەخۆیانو ژیانو گوزەرانیان دروستکردووەو رەخساندووە کە کەمێك جیاوازی هەیە لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتی ناوچەکانی تری کوردستان. ئەویش لەبەر ئەم خاڵانەیە بەڕای ئێمەو لەبەر رۆشنایی سەرچاوەکاندا:-

خاڵی یەکەم- هەورامان کەوتۆتە ناوچەیەکی چەپەكو ژینگە سروشتی‌یەکەی سەختو هەڵەتەو دووربوە لەرێگاکانی هاتووچۆوەو لەشکرکێشیەکانی دوژمنانی گەلی کورد زۆر نەیگرتوەتەوە، هەرچەندە کەوتۆتە ناوەڕاستی خاکی کوردستانیشەوە، هیچ دوژمنێك نەیتوانیوە بەتەواوەتی داگیری بکاتو دەستی بەسەردا بگرێت.[٧٢]

خاڵی دووەم- دوژمنە زۆرەکانی گەلی کوردو چاوتێبڕینیان لەداگیرکردنی خاکی کوردستان، ووشیارانە خەڵکی هەورامان لەپەرێزدا بوون کەخۆیان بپارێزن لەو داگیرکەرانە، کۆمەڵگا دورەدەستو دورەپەرێزەکان بۆ درێژەدان بەژیانو گوزەران پەنا دەبەنە بەر سستمی ئابوری خۆبژێوی.[٧٣] بەهەمان شێوە هەورامیەکان بۆ ژیانو گوزەرانیان پەنایان بردۆتە بەر سستمی ئابوری خۆبژێوی، ئەوەش کاریگەری بوە لەسەر دابڕانو پەیوەندی نەکردنیان بەدنیای دەرەوەو هۆکارێکی خۆپاراستنیشیان بوە لەدوژمنەکانیان.

خاڵی سێیەم- زۆری پێویستی‌یەکانیان پاڵنەر بون بۆ داهێنانی نوێ کەپێویستی‌یەکانیان دابین بکات، بۆیە ژیارو کلتوری تایبەتمەند

---

[٧٢] محەمەد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢-٧٣.

[٧٣] جماعة من الأساتذة السوفيت، موجز قاموس الأقتصادي، ترجمة الأستاذ مصطفى الدباس، دار الجماهير، دمشق، ١٩٧٢، ص٤٥٠.

بەخۆیان دروست کرد[٧٤] و بەپێی تیۆریی ناوچە کەلتورییەکان[٧٥] وبەپێی پرنسیپی پانتایی‌ی شارستانی‌و پانتایی‌ی کات[٧٦]، ناوچەیەك‌و ژینگەیەکی کۆمەلاّیەتی‌ی تایبەت لەهەورامان پەیدا بوو کە بەبەشێکی شارستانیەتی‌ی رەسەنی گەلی کورد دەژمێردرێ.

خالّی چوارەم- کارکردنی سەرەمڕەو هەمیشەیی‌و هاریکاری کردن‌و پێشبڕکێ لەناو ئەندامانی کۆمەلگای هەورامانـدا بـۆ مەبەسـتی پـڕ کردنەوەی پێویستی‌یەکانی رۆژانەیان‌و درێژەدان بەژیان‌و گوزەران ژینگەیەکی کۆمەلاّیەتی تایبەتمەندیان بۆ خۆیان رەخساندووە هەروەك ابـن خلـدون لـەوبارەوە دەلّێـت(کـەس بەتـەنها ناتوانێـت هـەموو پێویسـتی‌یەکانی ژیـان دەسـتەبەر بکـات، بـەلّکو پێویسـتی بەیارمەتی‌دان‌و هاوئاهەنگی‌ی کەسانی تر هەیە)).[٧٧]

## د-شێوەزاری هەورامی

شێوەزار- مەبەست لەکۆمـەلّێك هێمـای واتـاداری جیـاوازن، یـا شارەزایی‌یەکە پەیوەستە بەمرۆڤـەوەو نیشـانەی پێگەیشـتنی هـۆش‌و هەست‌و جولّەیەتی، وە ئامرازی پەیوەندی کردنی کۆمەلاّیەتی‌و هۆشی بنەڕەتی‌یەتی هەروەها هەلّسوکەوتەکانیەتی‌و ئاوێتەبوونی کۆمەلاّیەتی

---

[٧٤] د. شاكر مصطفى سليم، قاموس الأنثروبولوجيا، مصدر السابق، ص٢٢٨.

[٧٥] د. حسين فهيم، قصة الأنثروبولوجيا، المصدر السابق، ص١٦١. أو د. مجيد حميد عارف أثنوكرافيا شعوب العالم، وزارة تعليم العالي والبحث العلمي مكتبة الوطنية بغداد ١٩٩٠، ص٤٨.

[76] د.عبدالحميد لطفي، الأنثروبولوجيا الأجتماعية، دار المعارف بمصر، ١٩٧١، ص١٢٥.

[٧٧] د. عبدالباسط عبد المعطي، اتجاهات نظرية في علم الأجتماع(نقل من مقدمة ابن خلدون) مجلة عالم المعرفة، العدد٤٤، كويت، ١٩٨١، ص٨٠.

بونیەتی لەگەڵ ئەوانی تردا[78]. یاوەکو زمان چەند جوڵەیەکی دەنگین لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگایەکدا بەپێی چەند بنەمایەك کە لەسەر واتاکانیان رێککەوتون لەهەڵسوکەوتیانا دەردەکەون، بەو چەشنە زمان بوونی نی‌یە، بەڵکو دەستنیشانکردنی واتای ئەو جوڵەو هێماو دەنگانەیە کە بەپێی چەند بنەمایەك کۆمەڵگا لەسەری رێککەوتوەو بەکردارو کردەوەی ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگا دیاریکراوەدا دەردەکەوێت[79].

زمان(Language) پێکهاتەیەکە لەهێمای زارەکی کەواتای شتەکان یا هەڵسوکەوتەکان یاهۆش‌و بیرکردنەوەکان دەگەیەنێت، کەمرۆڤ بەکاریان دەهێنێت بۆ یەکتر تێگەیاندن‌و ئاڵوگۆڕکردنی بۆچونەکانی، وەبەهۆیەوە مرۆڤ لەئاژەڵەکانی تر جیادەبێتەوە جگە لەوەش کەبەشێکی گرنگی شارستانیەتی واتایی مرۆڤە، هیچ چالاکی‌یەکی کۆمەڵایەتی ناو ئەندامەکانی کۆمەڵگا بەبێ زمان روو نادەن، بەبێ زمانیش پەیوەندی بەژینگەوە ناکرێت‌و ئاگاداری تایبەتمەندیەکانی‌و رواڵەتەکانی نابێت.[80]

زمانی کوردی کەئامرازی پەیوەندی کردن‌و نووسین‌و شارستانیەتی گەلی کوردە، شێوەزاری هەورامی کەلقێکی گرنگی ئەو زمانەیە راو بۆچونی زۆری لەسەرە بەکورتی هەندێ لەو راو بۆچونانە دەخەینە روو:-

---

[78] د. عمر أحمد همشري، التنشئة الأجتماعية للطفل، ط١، دار صفاء للنشر والتوزيع- عمان-٢٠٠٣، ص٩٢.

[79] د. عبدالحميد لطفي، الأنثروبولوجيا الأجتماعية، المصدر السابق، ص٦٥.

[80] د. شاكر مصطفى سليم، قاموس الأنثروبولوجيا، المصدر السابق، ص٥٥١.

(شەرەف خان) لەشەرەفنامەدا دەڵێت(هۆزە سەرەکیەکانی کورد لەوبارەوە کەشێوەی ئاخافتن‌و هەندێك ئاکارو داب‌و دەستورو هەڵسوکەوتیان لێك جیاوازە... دەکرێن بەچوار بەشەوە، کرمانج، لوڕ، کەڵهوڕ، گۆران).[81] بەپێی رای ئەم مێژوونوسە شێوەزاری هەورامی دەچێتە لقی گۆرانەوە. زمانی کوردی لەدوو دیالێکتی سەرەکی پێکدێت، کەدیالێکتی ژوورو خوارووە وە هەریەکە لەمانەش چەند لقێکی لێ دەبێتەوە. (موکریان‌و هەکاری‌و شوکاك‌و بایەزید) سەر بەدیالێکتی کرمانجی ژوورون هەریەکە لەمانەش لقی تری لێ دەبێتەوە. (لەك‌و کرمانج‌و کەلهوڕو گۆران‌و لوڕ) سەر بەکرمانجی خواروون.

(مێجەر سۆن) دەڵێ گۆرانەکانی زەهاو هەورامی‌یەکی سنەو زازاو هەموو بەش‌و لقەکانی بەشێوەی ژووروی رۆژئاوا دەدوێن، هەروەها رای وایە زمانی کوردی چوار شێوەیە(کرمانجی، گۆرانی، لوڕی، زازایی).

(دی مۆرگان) دەڵێت زمانی کوردی لەم شێوەزارانە پێکهاتووە(موکریی رووسی، یەزیدیی بایەزیدی، سنەیی، کرماشانی، هەورامانی، جافی، رێژاوی، سلێمانی، لەکی، خوجرەندی).

بەڵام(مینۆرسکی) رای وایە زمانی کوردی لەم بەشانە پێکهاتووە:-

١-شێوەی خواروو- کرماشانی‌و سنەیی دەگرێتەوە.

٢-شێوەی رۆژهەڵاتی- سلێمانی‌و سابڵاخی‌و موکری دەگرێتەوە.

٣-شێوەی رۆژئاوایی- سەرانسەری کوردستان دەگرێتەوە.

بەڵام تۆفیق وەهبی رای وایە زمانی کوردی لەم دیالێکتانە پێکدێت:-

---

[81] شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی هەژار، کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی نعمان- نجف، ١٩٧٢، ل٢٨.

پەیوەندیی خێزانی تەنها ئەوەندەیە لەماڵێکدا دەژین و بەرامبەر مەترسییە دەرەکییەکان پارێزگاری لەیەکتر دەکەن، لەگەڵ منداڵەکانیاندا هەڵسوکەوت و رەفتارێکی ساردو سڕ ئەنجام ئەدەن بەبێ پەیوەندی خۆشەویستی و بەبێ راپەڕاندنی ئەرکی پەروەردەو فێرکردن.[٢٦]

-خێزانی بایالۆجی:- ئەو جۆرە خێزانەیە کە لەئەنجامی کرداری سێکسی نێوان نێرو مێدا پەیدادەبێت و شوێنی حەوانەوەو خۆشەویستی و یاساو ئایین و داب و نەریت رەچاو دەکرێن لەدامەزراندنیدا، جا یا منداڵ دەکەوێتەوە لەنێواندا یا بێ منداڵ دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا بەخێزانێکی بایالۆجی دادەنرێن.[٢٧]

-خێزانی کۆمەڵایەتی:- ئەو جۆرە خێزانەیە کەبۆ مەبەستی نەوە خستنەوە(منداڵ بوون) دروست دەکرێت. بەڵام ئەو منداڵانەی کەلەو نێرو مێیە دەبن بەناوی هیچ کامیانەوە نا ناسرێن لەیاساو داب و نەریتی ئەو کۆمەڵگایەدا، بەڵکو ئەو منداڵانە بەناوی کەسێکی ترەوە ناو دەنرێن کەمنداڵی لێ نەکەوتوەتەوەو کۆچی دوایی کردوە، بۆ ئەوەی وەجاغی کوێرنەبێتەوەو ناوو ناوبانگی نەسڕێتەوە لەناو بەرەی خێزانەکەیاندا، خێزانێك بەناوی ئەو کەسەوە دروست دەکرێت. ئەو دوو کەسەی کەخێزانە بایالۆجی یەکەیان دروست کردوەو کرداری سێکسی لەنێوانیاندا رو ئەدات و منداڵیان لێ دەکەوێتەوە، منداڵەکانیان بەناوی ئەو کەسەوە تۆمار ئەکرێن لەیاساو لەنەریتدا کەکۆچی دوایی کردوە، باوك و دایکە راستەقینەکە مافی ئەوەیان نییە منداڵەکانیان بەناوی خۆیانەوە ناو بنێن چ لەیاسادا چ لەداب و نەریتی ئەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا، تەنانەت لێشیان بەرپرسیارنین بەهیچ جۆرێك. ئەم جۆرە

---

[٢٦] د. شاکر مصطفى سليم، قاموس الانثروبولوجيا، المصدر السابق، ص٣٢٠.

[٢٧] المصدر نفسه، ص٣٢٩.

خێزانانە لەناو هەندێك لەكۆمەڵگا هۆزایەتی‌یەكان‌و تیرەگەرییەكانی ئەفریقیاو ئوستورالیادا پەیرەو دەكرێت وەك هۆزی(نویر).[٢٨] ئەمەش لەچەند هەل‌و مەرجێكدا روئەدات بۆ نموونە كاتێك پیاوێكی دەوڵەمەند كوری نابێت‌و كۆچی دوایی دەكات، كچەكەی دەتوانێت(خێزانێكی كۆمەڵایەتی) بەجۆرە هاوسەرێتی‌یەك دروست بكات كە بەناوی(هاوسەرێتی سێبەر-(زواج الشبح ghost marriage) لەنێرو مێ‌یەك، لەو نێرو مێ‌یە ئەو منداڵانەی كەلێیان ئەكەونەوە ئەوان لێیان بەرپرسیار نین، بەڵكو بەپێی یاساو بەپێی داب‌و نەریتی ئەو كۆمەڵگایە منداڵەكان بەناوی كەسە دەوڵەمەندە كۆچكردووەكەوە ناودەنرێن‌و دەناسرێن، وە دەبنە میراتگری كەسە دەوڵەمەندەكە، هەرچەندە هیچ پەیوەندی‌یەكی خزمایەتیشیان پێوەی نی‌یە، بەڵكو خێزانێكە بەناوی ئەوەوە دروست كراوە دوای مردنی بۆیە پێی دەوترێت(خێزانی شەبەح).[٢٩]

-خێزانی درێژ:- ئەو جۆرە خێزانەیە كەباوك‌و دایكێك منداڵیان دەبێت كورەكانیان ژن دێنن منداڵیان لێ دەكەوێتەوە، وەهەندێكی تر لەمنداڵەكانیان هێشتا خێزانیان دروست نەكردوە هەر هەموویان پێكەوە لەماڵێكدا دەژین‌و جێی حەوانەوەیان هەر ئەو ماڵەیە. كاتی واش هەیە كچەكانیش شوودەكەن لەو ماڵە جیا نابنەوە بەخۆیان‌و مێردو منداڵەكانیانەوە هەموویان پێكەوە ئەژین.[٣٠] ئەو جۆرە خێزانە

---

[٢٨] لوسي مير، مقدمة في الأنثروبولوجيا الأجتماعية، المصدر السابق، ص١٠٩.

[٢٩] د. أحمد أبو زيد، البناء الأجتماعي مدخل لدراسة المجتمع- الأنساق، المصدر السابق، ص٤٢٩.

[30] J. R. Eshleman, The Family, United States of America 2003, P.P. 40-41.

لەکۆمەڵگا کشتوکاڵییەکانو هۆزایەتییەکان پیادە دەکرێن پەیوەندی نێوانیان توندوتۆڵو بەهێزە هەر هەموویان هەست بەئەرکو فەرمانی سەرشانیان دەکەنو خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر بەژیانو گوزەرانو پاراستنی ناوو ناوبانگی ئەو خێزانە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بەجۆرێك رێك خراون کەسستەمێکی یەکگرتووی تەواوکەری یەکتر پێك دێنن. واتا (باپیر+ نەنك+ کورو ژنەکەیو منداڵەکانیان+ کچو مێردەکەیو منداڵەکانیان+ باوکی باپیرە گەورە+ دایکی نەنك دایە گەورە)[٣١] هەر هەموویان شوێنی حەوانەوەیان یەك ماڵەو لەو ماڵەدا هەڵسوکەوت دەکەن.

-خێزانی ئاوێتە:- ئەو جۆرە خێزانەیە کەپیاو زیاد لەهاوسەرێکی هەبێت(فرە ژنی)و لەهەموویان منداڵی هەبێتو پێکەوە بژینو هاوکاری یەکتری بکەن. واتا هەموویان لەرێی باوکیانەوە لەخێزانەکەدا بەیەکترەوە بەستراونەتەوە. کاتی واش ئەبێت ژنێك چەند شوویەك دەکات لەهەموو مێردەکانی منالی لێ دەکەوێتەوە هەموو منداڵەکانیو دواین مێردی پێکەوە ئەژین لەرێی دایکیانەوە منداڵەکان لەو خێزانەدا بەیەکەوە بەستراونەتەوە. ئەم جۆرە خێزانە بەخێزانی پێکهاتوو ناسراوە.

-خێزانی یەکگرتوو:- ئەو جۆرە خێزانەیە کەدوای کۆچی دوایی باوكو دایك، کوڕەکانیان ژن دێنن منداڵیان دەبێت هەموو براکانو ژنەکانیانو منداڵەکانیان پێکەوە لەیەك ماڵدا دەژین، کاتی واش دەبێت کچەکانیش شوودەکەن ئەوانیش منداڵیان دەبێت بەخۆیانو بەمنداڵەکانیانو مێردەکانیان لەگەڵ براوو براژنو برازاکانیاندا هەموویان پێکەوە لەیەك ماڵدا دەژینو جیانەبونەتەوە. بەڵکو پێکەوە

---

[٣١] د. قيس النوري، ما الانثروبولوجيا، المصدر السابق، ص٦٥-٦٦.

بەیەکگرتوویی دەمێننەوەو پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌و خزمایەتی‌یەکانیان بەهێزو بەتینتر دەبن‌و هەموویان هەست بەلێپرسراوێتی مانەوەی خێزانەکەیان دەکەن بەیەکگرتوویی بمێنێتەوە، هەرچەندە باوك‌و دایکیان ماوەیەکی دوورودرێژە کۆچی دوایی‌یان کردووە بۆیە بەناوی خێزانی یەکگرتوو ناودەبرێن یا دەناسرێن. ئەو جۆرە خێزانانەش لەکۆمەڵگا کشتوکاڵی‌یەکان‌و هۆزایەتی‌یەکان‌و تیرە گەرایەتی‌یەکاندا زۆرتر بەدی دەکرێن.[32]

-خێزانی بچووك(نووی-ذری):- بریتی‌یە لەو جۆرە خێزانەی کە لەماڵێکدا یەك پیاوو یەك ژن‌و منداڵەکانیان پێکەوە دەژین‌و بەجیا دانیشتون‌و ئەرك‌و مافەکانی خێزان بەسەربەستی‌و سەربەخۆیی جێبەجێ دەکەن‌و دابەشکردنی کارو یارمەتی دانی یەکتری‌و توندوتۆڵی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان‌و خۆشەویستی نێوانیان‌و هەست بەلێپرسینەوە بەرامبەر بەیەکتر، خەسڵەتەکانی ئەم جۆرە خێزانەن، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە لەبەر باری ژیان‌و گوزەران‌و ئابوری‌و پێویستی‌یە زۆرەکان‌و جەنجاڵی‌و زۆری کێشەو گیروگرفت‌و ململانێ جۆربەجۆرەکان پەیڕەوی پیادەکردنی خێزانی بچوك دەکەن، بۆ دورکەوتنەوە لەو هەموو کێشەو گیروگرفتانەی ژیان.[33] هەروەها خێزان لەسەر بنچینەی پشت کراوەتە دوو جۆرەوە کەئەمانەن:-

---

[32] د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل، بدون سنة الطبع، ص١٠٦.

[33] بيث هس وآخرون، علم الأجتماع، تعريب دكتور محمد مصطفى الشعبيني، دار المريخ للنشر، المملكة العربية السعودية، ١٩٨٩، ص٤١٤-٤١٥.

-خێزانی دایکایەتی:- لەسەردەمێکی مێژووی مرۆڤایەتی‌دا دایك بەرپرسیاربوە بەرامبەر بەخێزان‌و بەناوی دایکی‌یەوە خێزان ناوبراوە، لەهەندێ کۆمەڵگاشدا پشتی دایك واتا خاڵو پوور لەپێش پشتی باوکەوەن واتا لەپێش مام‌و پورن لەباوکەوە، ئەرکی لێپرسینەوەی خێزان دوای باوك بەخاڵ دەسپێردرێت بۆیە بەو چەشنە خێزانانە دەوترێت خێزانی دایکایەتی، هەروەها منداڵ ناسنامەکەی بەناوی دایکی‌یەوە دەبێت بەپێی یاساو نەریت، کاتی واهەیە ژنەکە چەند شوویەك دەکات‌و لەهەموویان منداڵی لێ دەکەوێتەوە ئەو منداڵانە کەباوکیان جیاوازە هەموویان بەناوی دایکیانەوە دەناسرێن.

-خێزانی باوکایەتی:- ئەو جۆرە خێزانەیە کە لەبەشی هەرەزۆری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئێستادا پەیڕەو دەکرێت، پێشی دەوترێت(باوك سالاری) واتا باوك بەرپرسیارە لەهەڵسوڕاندنی ئەرك‌و فەرمانەکانی خێزان وەهەر ئەویش بەرپرسیارە لەدابینکردنی پێویستی‌یەکانی خێزان. هەروەها پشتی باوك لەپێش پشتی دایکەوەیە، واتا باپیرو مام‌و پوور لەباوکەوە لەپێشترن تا باپیرو خاڵو پوور لەدایکەوە. ناسنامەی منداڵ بەناوی باوکەوە دەبێت‌و باوك بەرپرسیارە بەپێی یاساو داب‌و نەریت لەو جۆرە خێزانانەدا. کاتی واهەیە پیاوێك چەند ژنێك دێنێت لەهەموویان منداڵی لێ دەکەوێتەوە ئەو منداڵانە کەدایکیان جیاوازە هەموویان بەناوی باوکیانەوە بانگ دەکرێن‌و دەناسرێن.[٣٤] هەروەك لەهێلکاری(٣) هەندێك لەخێزانەکان دیاری کراون.

[٣٤] د. أحمد أبو زيد، البناء الاجتماعي مدخل لدراسة المجتمع- الانساق، المصدر السابق، ص٣١١-٣٤٠.

## هێلکاری(٣) هەندێك جۆری خێزانەکان نیشان ئەدات

خێزانی درێژ- لەسەرەوە ئەو خێزانە لەباوكو دایكێكی زیندوو كە لەسێ كوڕو كچێك پێك هاتوون، دوان لەكوڕەكانی ژنیان هێناوە بەهەردوكیانەوە حەوت منداڵیان هەیە لەگەڵ ژنەكانیانو ئەو براو خوشكەی كەهێشتا خێزانیان دروست نەكردوە هەموویان پێكەوە لەماڵێكدا دەژین.

خێزانی پێك هاتوو- لەسەرەوە ئەو خێزانە لەپیاوێك كەدوو ژنی هێناوە لەژنێكیان دوو كچو دوو كوڕی هەیە، وەلەژنەكەی تری كوڕێكو دوو كچی هەیە هەموویان پێكەوە لەماڵێكدا دەژین.

خێزانی پێك هاتوو- لەسەرەوە ژنێك دوو شوی كردوە لەپیاوێكیان دوو كچی بووەو مێردەكەی مردوە، شوی كردوەتەوە بەپیاوێكی تر، دوو كچەكەی لەگەڵ خۆی بردوە، لەپیاوی دووەمی سێ كوڕی بووە، هەموویان پێكەوە لەماڵێكدا دەژین.

خێزانی یەكگرتوو- لەسەرەوە ئەو خێزانە لەباوك‌و دایكێك كەدوو كوڕیان بوە، كوڕەكان ژنیان هێناوە، یەكێكیان سێ منداڵ‌و ئەوی تریان دوو منداڵی بووە، پاش مردنی دایك‌و باوكەكە كوڕەكان بەژن‌و منداڵەكانیانەوە لەیەك ماڵدا دەژین بەیەكگرتویی‌و جیانەبونەتەوە.

خێزانی بچووك- لەسەرەوە ئەو جۆرە خێزانە لەژنێك‌و پیاوێك‌و چوار منداڵ پێك هاتووە كە لەماڵێكدا دەژین.[٣٥]

---

[٣٥] شاكر مصطفى سليم، المدخل الى الأنثروبولوجيا، جامعة الكويت، ١٩٨١، ص٤١. أو د. أحمد أبو زيد، البناء الاجتماعي مدخل لدراسة المجتمع- الانساق، المصدر السابق، ص٣١٢--٣٤٠. أو محمد مصطفى أحمد، بيارة، رسالة ماجستير، المصدر السابق، ص١٠٤. أو نوري ياسين هرزاني، الكاكائية، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الآداب جامعة بغداد غير منشورة، ١٩٨٥، ص١٦٦.

خێزان لەکۆمەڵگای هەوراماندا گرنگیو بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. بەسەرچاوەی پەروەردەو فێرکردنو ژیانو گوزەرانو جێگیری ژیانی کۆمەڵایەتی سەیر دەکرێت، جگە لەوەی بایالۆجی‌یەکی، پێگەیەنەری تاكو فێرکەریەتی وەدیاریکەری رۆڵو پێگەی کۆمەڵایەتیی تاکە. هەرچەندە رۆڵو پێگەی تاك بەهۆی تێکۆشانی خۆیەوە دەستی دەکەوێت، بەڵام خێزان یەکەم هاندەرو یارمەتی دەریەتی بۆ بەدەست هێنانی ئەو رۆڵو پێگە کۆمەڵایەتی‌یە کە لەکۆمەڵگادا دەیان گێرێت.

خێزان بچوکترین یەکەی کۆمەڵایەتی‌یە لەکۆمەڵگای هەوراماندا، هەروەها یەکەم ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەندامەکانی‌یەتی، هەرئەوە ئەندامەکانی گۆش دەکاتو پەروەردەیان دەکاتو فێریان دەکاتو کاروپیشە بۆ هەموو ئەندامێکی ناو کۆمەڵگاکە دەست نیشان دەکاتو ئەرکی خەرج کێشانی ئەندامەکانی ئەکەوێتە ئەستۆ لەهەموو کاروبارێکی رۆژانەیاندا.

لەکۆمەڵگای هەوراماندا (چوار جۆر خێزان) پێکەوەنان پەیرەو دەکرێت، کە لەقۆناغە مێژوویی‌یەکانی کۆمەڵگاکەدا یەك لەدوای یەك پەیدابوون، تا ئێستاش وەك پێویستی‌یەك لەهەندێ کاتدا پێك دێت وەك(خێزانی درێژ، خێزانی پێکهاتوو، خێزانی یەکگرتوو) پەیرەو دەکرێنو ئاسەواریان ماوە. بەڵام وەك پێویستی‌یەکی کۆمەڵگای ئێستای هەورامان بەزۆری پەیرەوی پێکەوەنانو دروستکردنی(خێزانی بچووك) دەکرێت.[٣٦] کەهەر یەکەیان بەجیا باس دەکەین:-

### ١-خێزانی درێژ

هەلومەرجی ژینگەی جوگرافیاییو ژینگەی کۆمەڵایەتی هەورامان وای پێویست کردوە ئەو جۆرە خێزانە پەسەند بێت بۆ قۆناغێکی

---

[٣٦] محمد مصطفى أحمد، بياره، دراسة سوسيو أنثروبولوجية، المصدر السابق، ص١٠٧.

مێژووی کۆمەڵگای هەورامان، چونکە باری ئابوریو باری رامیاریو باری کۆمەڵایەتی لەو سەردەمەدا پێویستی بەو جۆرە خێزانە بووە بۆ خۆپاراستن لەدیاردە مەترسی دارەکانو دابینکردنی ئاسایشو دەستەبەرکردنی خۆراكو شوێنی حەوانەوەو ئیشو کاری تر بۆیە پێویستی بەژمارەیەکی زۆری ئەندام بوە لەماڵێکدا، کەهاوکاریو هاریکاری یەکتر بکەنو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان توندو تۆڵ بنو راستەوخۆ بن بۆ بەسەربردنی ژیانێکی بەکۆمەڵ. تا ئێستاش لەلادێو دێکانی هەوراماندا ئەو جۆرە خێزانە پەیرەو دەکرێتو ئاسەواری ماوە کە(باپیر+ نەنك+ منداڵەکانیان+ نەوەی منداڵەکانیان بەکورو کچەوە) هەموویان پێکەوە لەماڵێکدا دەژین.

## ٢-خێزانی ئاوێتە

خێزانی پێکهاتوو لەپیاوێكو لەهاوسەرێك زیاتر، یا لەژنێكو چەند شوویەکی یەك لەدوای یەك زیاتر، بەمنداڵەکانیانەوە پێك دێت کە لەماڵێکدا دەژین. ئەم جۆرە خێزانە لەکاتی پەیدابونی ئایینی ئیسلامو بڵاوبونەوەی لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا پەیدابووە. چونکە بنەماکانی ئەو ئایینە رێ ئەدات بەپیاو زیاد لەهاوسەرێکی هەبێتو رێگری لەمنداڵ بونی زۆریش ناگرێت، هەروەها رێ ئەدات بەژن کەچەند شوویەك بکات یەك لەدوای یەك چ بەهۆی جیابونەوە بێت(تەلاق) یا بەهۆی لەدەست دانی هاوسەرەکانیەوە بێت بەمردن[٣٧]

کۆمەڵگای هەورامان بەوە ناسراوە کەکۆمەڵگایەکە بەتوندی پەیرەوی بنەماو بیروباوەڕە ئیسلامییەکان دەکات.[٣٨] ئەو ئایینەش رێخۆشکەرە بۆ پەیدابونی ئەم جۆرە خێزانە بۆیە باری کۆمەڵایەتیو

---

[٣٧] حمد مصطفى أحمد، سەرچاوەی پێشوو.

[٣٨] حمد مصطفى أحمد، بيارە، دراسة سوسيو أنثروبولوجية، المصدر السابق، ص١٣٢.

ئـاینیو ئـابوری کۆمـەڵگای هـەورامان هانـدەری دروسـت بـوونو پەیدابوونی ئەم جۆرە خێزانەن بەتایبەتی.((دوای ئەوەی کە بەزۆر ئیسلام کراوە))[٣٩] بۆیە مەڵبەندێکی گرنگی ڕێبـازی نەقشـبەندییەکان بـۆ زۆر بـوونی ژمـارەی دانیشـتوانو زۆربـوونی لایـەنگرەکانیانو دابینکردنـی بژێویانو کارپێکردنیان هـانی کۆمەڵگاکـەیان دا کەئـەم جـۆرە خێزانـە پەرە پێ بدەنو پشتیوانیشـیان لێکـرد، لـەڕوی پێکهاتەیـەوە(پیاوێك+ چەند هاوسەرێك بەمـنداڵەکانیانـەوە) هـەموویان لەیـەك مـاڵـدا پێکـەوە ئەژین. یان(ژنێك+ منداڵەکانی کـە لەچـەند شـوویەك بویـەتی+ دوایـن شووی) هەموویان پێکەوە لەیەك ماڵدا دەژین.

## ٣-خێزانی یەکگرتوو

ئـەم جـۆرە خێزانـە لەکۆمـەڵگای هەورامانـدا پـەیڕەو دەکرێـت لەبەرپێویسـتی ژیـانی کۆمەڵایـەتیو ئـابوریو رامیـاریو ئـایینی. پێکهاتەکـەی دوای ئـەوەی پیاوێـكو ژنێـك هاوسـەرگری یـەکتر دەبـن، منـداڵیان لـێ دەکەوێتـەوە کوڕەکانیـان ژن دێـنن، بـەخۆیانو بەژنەکانیانەوەو بەمنداڵەکانیانەوە، لەماڵێکدا لەگەڵ بـاوكو دایکیانـدا دەژیـن. کاتێـك کـەباوكو دایکیـان کۆچـی دوایـی دەکـەن، کوڕەکـانو ژنەکانیانو منداڵەکانیان پێکەوە لەهەمان مـاڵـدا دەمێننـەوەو پێکـەوە دەژیـنو جیانابنـەوە، بۆیـە پـێی دەوترێـت خێزانـی یـەکگرتوو، پەیوەندییەکانیان تونـدوتۆڵو روبـەڕونو هەمیشـەیین یارمـەتی یـەکتر ئـەدەنو هاوکـاری یـەکتر دەکـەن، بەرژەوەنـدیی خێـزان لەسـەروو بەرژەوەندییـە تایبەتـەکانی خۆیانەوەیـە. پێکهاتەکـەی(چـەند کوڕێـك+ ژنەکانیان+ منداڵەکانیان) هەر هەموویان پێکەوە لەماڵێکدا دەژین.

---

[٣٩] ائدي، ولاتگیری رەشەخاکی عیاق، وەرگێڕانی مەلا جەمیلی رۆژبـەیانی، یەکـەم چـاپ، ١٩٩٧، ل٣٥-٣٦.

### ٤-خێزانی بچووك(نووی-ذری)

لەناو کۆمەڵگای هەورامانی ئێستادا بەزۆری پێکەوەنانی ئەم جۆرە خێزانە باوە ئەوەی کاری کردۆتە سەر گەشەکردنو پەرەسەندنو جێگیربونی ئەم جۆرە خێزانە لەهەورامانندا(ژیانی ئابوریو ژیانی کۆمەلایەتیو ژیانی رۆشنبیرییە). کۆمەڵگای هەورامان پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی لاواز بوون، پێویستی زۆرو ژیانی رۆژانەو گوزەرانی قورسو جەنجاڵی ژینگەو پەیدابونی کێشەو گیروگرفتی زۆرو بەرزبونەوەی ئاستی رۆشنبیریو زانستو خوێندەواریو بلاوبونەوەی هۆکانی پەیوەندی کردنو راگەیاندنو فراوان بوونو ئاسان بوونی رێگاکانی هاتوچۆ هەموویان هاندەرو پشتیوانی سەرهەڵدانو جێگیربوونی ئەم جۆرە خێزانەن لەناو کۆمەڵگای هەورامانندا. پێکهاتەکەی(پیاوێك+یەك هاوسەر+ منداڵەکانیان) پێکەوە لەماڵێکدا دەژین. خۆیان بەرپرسیارن لەپەروەردەو فێرکردنو ژیانو گوزەرانی منداڵەکانیانو پاراستنی خێزانەکەیان لەدیاردە دزێوو مەترسی دارەکان کەرۆژانە بەهۆی پێشکەوتنو گەشەکردنی زانستەوە روو لەکۆمەڵگاکانی جیهان دەکەن. سەیری هێڵکاریەکە بکە.

**خزمایەتی** Kinship

بریتییە لەسستمێکی رێکوپێکی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا، کەئەو تاکانە بەیەکترەوە دەبەسترێنەوە بەتۆڕێك کەلەو پەیوەندییانەو لەو یەکتر گرتنانە پەیدا دەبێت، نەك لەسستمەکە خۆی.[٤٠] هەروەها خزمایەتی دانپیانانێکی کۆمەلایەتییە بەپەیوەندییە زیندوەکانیشیانەوە. لەلایەکی ترەوە خزمایەتی بریتییە

---

[٤٠]. أحمد أبوزيد، البناء الأجتماعي مدخل لدراسة المجتمع- الأنساق، المصدر السابق، ص٣١٢.

لەپەیوەندی‌یەکی کۆمەڵایەتی کە لەسەر پەیوەندی خوێن(پشت)ی راستەقینە، یا(پشت)ی دروستکراو یا(پشت)ی هزری خەیاڵی دروست بووە.[41] لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەست بونێکی دان پیانراوی کۆمەڵایەتی‌یە، ئەو پەیوەست بونەش لەسەر بنەمای خوێن(پشت)و رەچەڵەك لەنێوان باوك‌و دایك‌و نەوەکانیان وەستاوە. هەروەها خوشك‌و براش دەگرێتەوە.[42]

بەتێکڕا خزمایەتی دوو جۆرە(فیزیکی‌و کۆمەڵایەتی)یە. مەبەست لە(فیزیکی) ئەو خزمایەتی‌یەیە کە لەپشتی باوك(نێر) کەپێی دەوترێت هێڵی باوکایەتی، یان لەپشتی دایکەوە(مێ) کەپێی دەوترێت هێڵی دایکایەتی، پەیدا دەبێت واتا(خزمایەتی بایۆلۆجی) دەگرێتەوە.[43] بەڵام خزمایەتی کۆمەڵایەتی، ئەو خزمایەتی‌یە کەبە(پشت)ەوە نەبەستراوە، واتا نە لەرێی باوکەوە وە نەلەرێی دایکەوە پەیوەندی‌یە خزمایەتی‌یەکان دروست نەبوون، بەڵکو لەرێی(نشینگە) واتا شوێنی نیشتەجێ بوون‌و پێکەوە ژیانەوە پەیوەندی‌یە خزمایەتی‌یەکان دروست بوون لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیوەندی‌یانە تۆکمەو توندو تۆڵ‌و پتەون‌و لەکاتی پێداویستدا دەردەکەون.

خزمایەتی لەکۆمەڵگای هەوراماندا بەدەر نی‌یە لەو خزمایەتی‌یانەی کە لەسەرەوە باس کران، بەڵام زۆرتر(خزمایەتی کۆمەڵایەتی) پەسەندترەو لەناو کۆمەڵگاکەدا رەنگی داوەتەوە. چونکە کۆمەڵگای هەورامان لە(هۆزو تیرەو پشت‌و رەچەڵەك... هتد) پێك نەهاتووە، بەڵکو لەسەربنەمای(تاك‌و خێزان‌و بنەماڵەو Groupو لادێ‌و دێ‌و شارۆچکە)

---

[41]. احسان محمد الحسن، موسوعة علم الأجتماع، المصدر السابق، ص٥٠٨

[42]. شاكر مصطفى سليم، قاموس الأنثروبولوجيا، المصدر السابق، ص١٠٠٥.

[43]. أحمد أبو زيد، المصدر السابق، ص٢٩٤.

دامەزراوە. پەیوەندیی خوێن و پشت رۆڵێکی ئەوتۆیان نیە کەشیاوی باس کردن بێت.

پەیوەندییە خزمایەتییەکان لەکۆمەڵگای هەوراماندا لەسەرئاستی (هاوجێیی- نشینگە، هاوزمانی، هاوبەرژەوەندی) دامەزراوە، رەنگە تۆزێك لە(بدنە)ی عەرەبییەوە لێکچونیان هەبێت، بەڵام(بدنە) لەسەر هێڵێکی خوێن دامەزراوە، لەو روەوە لەوێش جیاوازە. کەواتە پەیوەندییە خزمایەتییەکانی کۆمەڵگای هەورامان لەجۆری(خزمایەتی کۆمەڵایەتی)یەوە نزیکن، هەرچەندە خزمایەتی کۆمەڵایەتی لەسەر بەرژەوەندییەکان دامەزراون گیانی خۆشەویستیو هاوسۆزیو خۆبەختکردنیان کەمە، پەیوەندییە خزمایەتییەکانی کۆمەڵگای هەورامان لەسەر ئاستی سوودو بەرژەوەندی گشتی دامەزراون.

کەواتە خزمایەتی لەکۆمەڵگای هەوراماندا جۆرە تایبەتمەندییەکی پێوەدیارە، کەتایبەتە بەکۆمەڵگاکە خۆیو پەیوەندییەکانی لەسروشتە جوگرافییەکەیو سروشتە کۆمەڵایەتییەکەی سەرچاوەیان گرتووە.

هەورامییەکان خێڵەکی نینو هۆزو تیرەش نین، بەڵکو کۆمەڵگایەکن خاوەن دابو نەریتو سستمێکی تایبەتن کە بەتۆڕێك لەپەیوەندییە خزمایەتییەکان بەیەکترەوە بەستراونەتەوە(یەکەی نشینگە)ش فاکتەری پەیدابونی جۆری خزمایەتییەکەیانە کەئەوەش تایبەتە بەخۆیانو کاری کردۆتە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانو پەیوەندییە ئابورییەکانیانو پەیوەندییە رۆشنبیرییەکانیانو تەنانەت پەیوەندییە ئایینییەکانیشیان، هەروەها پەیوەندیشیان هەیە بەچالاکییە رامیارییەکانیانەوە کەبەشێکن لەژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای

هەورامان. خزمایەتی هەر وەك لەسەرەتاوە ئاماژەی پێکرا لەژینگە سروشتی‌یەکەی‌و لەژینگە کۆمەلاّیەتی‌یەکەیەوە دەست پێ دەکات، تا سستمێکی ڕێکوپێك لەپەیوەندی‌یە ئالّوگۆڕەکان دادەمەزرێت، کەیەك کار لەوی تردەکات‌و بەیەکەوە بەستراون‌و تەواوکەری یەکترن‌و کۆمەلّگا ڕێك دەخەن‌و یەکەیەکی خزمایەتی پەیدا دەبێت بەناوی(بنەمالّە)وە، کەزۆری پەیوەندی‌یەکان‌و داب‌و نەریتەکان‌و تەنانەت هەلّسوکەوتی تاکەکان ناوو ناوبانگی بنەمالّە کاریان لێ دەکات.

### ٣-بنەمالّە

لەدوای خێزانەوە دووەم یەکەی پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی‌یە، بنەمالّە سەرچاوەکەی خێزانە کاتێك وەچەی خێزانێك زۆر دەبن‌و منداڵیان لێ دەکەوێتەوە چەند خێزانێکی سەربەخۆ یان سەربەست دروست دەبن بەناوی خێزانی یەکەمەوە دەناسرێن، هەریەك لەم خێزانە نوێیانە بەرپرسی خۆی هەیە کە بەرپرسیارە بەرامبەر بەخێزانەکەی‌و پاراستنی پەیوەندی‌یە کۆمەلاّیەتی‌یەکانی لەگەلّ خێزانەکانی تردا بەبێ جیاوازی ئەم خێزانە نوێیانە خسلّەتی یەکەم خێزان وەردەگرن ئیتر ئەو خێزانە لەڕەگەزی(نێر بێت- مێ) جیاوازی نی‌یە بۆ نموونە دەلّێن بنەمالّەی(زۆراب) بۆ نێر ئیتر هەموو خێزانەکان کەتازە دروست بوون بەو بنەمالّەوە دەناسرێن وەك شوێنی نیشتەجێ بوونی(دێ- لادێ) کەدا بەلاّم کاتێك لەشوێنی نیشتەجێ دوور دەکەوێتەوە بەناوی(نشینگە)کەیەوە دەناسرێت بۆ نموونە دەلّێن خەلّکی گوندی گولّپە یا تەوێلّەیە ئیتر ئیتر بنەمالّەکەی نا ناسرێت. هەروەها بۆ(مێ) دەلّێن بنەمالّەی(خاوەر) لەدێ یا لادێ‌کەدا ناسنامەی خۆی وەرگرتوە

کەلەو بنەماڵەیەیە بەلام کەچووە دەرەوە بەناوی شوێنی نیشتەجێ بونەکەیەوە دەناسرێت نەك بەناوی بنەماڵەکەیەوە.

ئەم بنەماڵانە کاتێك کەزیاد دەکەنو یەکەیەکی نشینگەی جوگرافی پێك دەهێنن دەبنە گروپ چەند گروپێك دەبنە دانیشتوانی(لادێ، دێ، شارۆچکە) یەك زۆرجار رێك دەکەوێت دانیشتوانی لادێیەك لەیەك بنەماڵە پەیدابوون، یا بنەماڵەیەك لەچەند لادێیەکدا نەوەی هەیە بەناوی بنەماڵەکەشو شوێنی نیشتەجێ بونیشیەوە دەناسرێتەوە.

بەلام لەکۆمەڵگای هەورامانـدا رێك نەکەوتوە دێیەك یا شارۆچکەیەك سەرپاکی دانیشتوانەکەی یەك بنەماڵە بن بۆ نموونە شارۆچکەی بیارە لەم بنەمالانە پێك هاتووە(بنەماڵەی شێخان، بەگە رووتە، گشتی خەڵك- کەئەمانەش هەریەك لەچەند خێزانێك پێك هاتوون) ئەم بنەمالانە هەموویان بەکۆمەڵێك پەیوەندی بەیەکەوە بەستراونەتەوە کەیەك تەواوکەری ئەوی ترە وە تۆرێك لەپەیوەندییە ئابورییەکانو کۆمەلایەتییەکانو رامیارییەکانو رۆشنبیرییەکان پێك دێنن کەسستمێك رێك دەخەن بۆ بەرێوەبردنو درێژەدان بەژیان لەو نشینگەیەدا کەهەر هەموویان لێی بەرپرسیارن بەبێ جیاوازی. سەیری خشتەی(٢) بکە کەزاراوە خزمایەتییەکان نیشان ئەدات.

## خشتەی(٢)

## زاراوە خزمایەتییەکانی کۆمەڵگای هەورامان

| شێوەی هەورامی | شێوەی سۆرانی | تێبینی |
|---|---|---|
| ئەدا، ئەیا | دایك | بۆ نوسینی وشەی(دایك) بەشێوەی هەورامی پێویستی بەپیتێك هەیە، بەلام لەئەلف‌و بێی زمانی کوردیدا ئەو پیتە دیاری نەکراوەو نەناسراوە وەك گەدا، سەدا... هتد). |
| تاتە | باوك | |
| واڵی | خوشك | |
| برا | برا | |
| بابا | باپیر | بۆ باوکی دایك‌و باوکی باوك چوون یەکە |
| ماما | نەنك، نەنە | بۆ دایکی باوك‌و دایکی دایك چوونیەکە |
| مەتی | پورر | بۆ خوشکی باوك‌و خوشکی دایك چوون یەکە |
| مامۆ | مام | |
| لالۆ | خاڵ | |
| مەتی‌یەزا | پورزا | بۆ ئەوەی خوشکی باوك‌و خوشکی دایك چوون یەکە |
| مامۆزا | ئامۆزا | |
| لالۆزا | خاڵۆزا | |
| وارەزا | خوشکەزا | |
| برازا | برازا | |
| کوڕم | کوڕم | |
| کناچێم | کچم | |

| | | |
|---|---|---|
| مەتی‌یەو ئەێم | پوری دایکم | |
| مەتی‌یەو تاتەیم | پوری باوکم | |
| مەتی‌یە زاوئەیم | پورزای دایکم | |
| مەتی‌یە زاوتاتەیم | پورزای باوکم | |
| پەشتەو ئەێم | پشتی دایکم | خزمەکانی دایك ئەوانەی کەپەیوەندی خزمایەتیان دوورە |
| پەشتەو تاتەیم | پشتی باوکم | خزمەکانی باوك ئەوانەی کەپەیوەندی خزمایەتیان دوورە |
| بنەمالۆ ئێمەن | بنەماڵەی ئێمەیە | ئەو خزمانەن کە لەنشینگە دور کەوتونەتەوەو ناناسرێن. |

تێبینی ١-لالۆ، مامۆ:- لەناو نشینگەدا (دێ، لادێ، شارۆچکەدا) بۆ هەموو نێرێك بەکاردەهێنرێت وەك چۆن لەسۆرانی‌دا (کاك) بەکاردێت بۆ نێر.

٢-مەتی:-لەناو نشینگەی کۆمەڵگای هەورامانـدا بۆ هەموو مێ‌یەکی بەتەمەن بەکاردەهێنرێت وەك چۆن لەسۆرانی‌دا (دادە، باجی) بەکاردەهێنرێت.

### ٤-لادێ، دێ، شارۆچکە

دوای تاك‌و خێزان‌و بنەماڵە، (لادێ- دێ- شارۆچکە) بەدوایین یەکەی پێکهاتەی کۆمەڵگای هەورامان دەژمێرێن لەڕوی ژمارەی دانیشتوانەوە.

گرنگترین فاکتەر بۆ دروست بونی ئەو یەکە نشینگانە(شوێنە جوگرافییەکەیەتی)، کەتوخمەکانی(ئاو، زەوی، روبەخۆر، روەکی خۆڕسك) بڕیاردەرن بۆ ئەوەی ئەو شوێنە جوگرافییە بکرێت بەنشینگە. وەئەو نشینگەیە بەیەکێك لەو توخمە سروشتیانەوە دەناسرێت.

هەندێ کاتیش بەناوی کسێك کەدامەزرێنەری نشینگەکە بووە ناو دەنرێت وە(ئەحمەد ئاوا) کەکاتی خۆی ئەحمەد ناوێك بۆ یەکەم جار لەو شوێنە جوگرافییەدا خانوی دروست کردووە دواتر گەشەی کردووەو بوە بەدێ. ئەگەر سەیری دێکانی ترو شارۆچکەکانی تری هەورامان بکرێت بەناوی توخمە جوگرافییەکانەوە ناونراون‌و ناسراون. تا ئێستا لەهەوراماندا شاری گەورە دروست نەبوە هەرچەندە مێژووی هەندێ لەدێکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مادەکان وەك دێکانی(ئالپی- هێلانپێ، هارهار- شاری هەورامان، زاوەر، بارا- بیارە، رەزاو... هتد).[٤٤] هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ژینگە سروشتی‌یە جوگرافییەکەی کەڕێگرە لەبەردەم فراوان بون‌و گەشەکردنی نشینگەکاندا کەنابنە شاری گەورەو ژمارەی دانیشتوانیان زیاد ناکات کەواتە جوگرافیای هەورامان پاڵنەرو دەرکەرو کۆچکەری دانیشتوانە نەك وەرگری.[٤٥]

پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی(لادێ‌و دێ‌و شارۆچکەکانی هەورامان) بەجۆرێك رێك خراون کسستمێکی تایبەتی لەڕوی

---

[٤٤] ی. م. دیاکۆنۆف، میدیا، وەرگێڕانی برهان قانع، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣-٢٣٤.

[٤٥] یرێز حسن، گۆڤاری هەورامان ژمارە ١ ، سەرچاوەی پێشوو، ل٦-٧.

کۆمەڵایەتیو ئابوریو ئایینیو رامیاریو رۆشنبیری دروست دەکات کەیەك تەواوکەری ئەوی ترە لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەو ئەو سستمە دروستکراوەدا، پێویستە هەموو ئەندامێك پێگەو رۆڵی تایبەتیو بەرچاوی هەبێت، وە هەموو ئەندامێك زیاد لەکارێك راپەڕێنێت لەناو کۆمەڵگاکەدا ئەوەی یارمەتیدەرە کەئەم پەیوەندییانەو ئەم سستمە لەکارنەکەوێتو کاریگەری هەبێت لەسەر کۆمەڵگاکە ئەم خاڵانەیە:

١-دڵسۆزیو کارکردن بەبێ فرتو فێڵو خۆدزینەوەو تەمەڵی.

٢-تێکۆشانو کۆڵنەدانی خەلکەکەی.

٣-بەکارهێنانی سەلیقەو ووردیو ژیری لەکارکردندا.

٤-راپەڕاندنی چەند رۆڵێك لەیەك کاتدا.

٥-گوێڕایەڵیو مل کەچ کردنو رێزگرتن لەخوارەوە بۆ سەرەوە.

٦-رەچاوکردنو پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی.

٧-هاریکاری کردنو یارمەتی دانی یەکتر لەئیشو کارە قورسو زۆرەکاندا.

٨-کارکردن بەشێوەی گەلکاریو بەدەسەوام- دەستیاوو بێ بەرامبەر.

٩-هەوڵدان بۆ فێربونی هەموو کارو پیشەیەك بەنێرو مێوە.

١٠-خولیاو گەڕان بەدوای زانستو زانیاریدا.

١١-بەشداری کردن لەهەموو خۆشیو ناخۆشییەکی یەکتردا.

ئەو سستمە کەکۆمەڵگای هەورامان پەیڕەوی ئەکات سستمێکی(تایبەتی)یە واتا کۆمەڵگاکە خۆی لەناو خۆیدا زۆرینەی پێویستییەکانی پڕ دەکاتەوە، هەر ئەوەشە کەبۆتە فاکتەرێکی کاریگەر کەکۆمەڵگای هەورامان خاوەنی شارستانەتێکی تایبەتی خۆی بێتو

لەدەوروبەرەوە زۆر بەکەمی کاریگەری خراپیتە سەرو خاوێنی خۆی پاراستوە بەدرێژایی مێژوو.

بەکورتی پێکهێنەرەکانی پێکهاتەی کۆمەڵگای هەورامان لەڕوی دانیشتوانەوە خرانە روو کەهەریەك تەواوکەری ئەوی ترە بەپێی ئەو سستمە تایبەتی‌یەی کۆمەڵگاکە کەژینگە جوگرافییەکەی‌و پێگەو ڕۆڵو فرە کاری ئەندامەکانی فاکتەری سەرەکی بوون بۆ پاراستنی هێمنی‌و ئارامی‌و ئاسایش لەکۆمەڵگاکەداو دوور کەوتنەوەی لەکێشەو گیروگرفت. بەڵام لەبەرئەوەی ژیان لەگۆڕاندایەو پێویستی‌یەکان رۆژ بەرۆژ زیاد دەکەن‌و هۆکانی پەیوەندیش بەرفراوان بوون‌و بێگومان کۆمەڵگای هەورامان لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە گۆڕانێکی بەرچاوو خێرای بینیوە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا. بۆ پێکهاتەی کۆمەڵگای هەورامان لەڕوی مرۆیی‌یەوە سەیری هێلکاری(٤) بکە.

## هێڵکاری(٤)

کۆمەڵگا، شارۆچکە- لادێ-دێ ،

بنەماڵە، خێزان، تاک

## باسی دووەم

# ژیانی ئابووریی هەورامان

مەبەست لەژیانی ئابووری شێوەی گوزەرانو ڕێگاکانی بەرهەم هێنان دەگرێتەوە کەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی پشتی پێ بەستوەو بژێوی خۆی پێ دەستەبەر کردووە، ئەو شێوە ژیانە لەسەرەتاوە سادەو ساکار بوەو وردە وردە گرانو ئاڵۆز بووە، بەمەبەستی رازانەوەو ڕێکخستنی پێویستییەکانی ژیان.[1] ژیانی ئابووری هەموو کۆمەڵگایەك لەسەر(هۆکانی بەرهەم هێنانو پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان)وەستاوە.[2] ئەوانەش لەڕێی ئەم چالاکییانەوە(بەرهەم هێنان، ئاڵوگۆڕ، دابەشکردن، بەکاربردن)ەوە پێویستییەکان پڕدەکەنەوە.[3]

ژیانی ئابووریی مرۆڤایەتی بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە کەقۆناغەکانی(کۆکردنەوە، ڕاوو شکار، ئاژەڵداری، کشتوکاڵ، پیشەسازی)یە.[4] ئەو قۆناغانەش بەپێی سەردەمە مێژووییەکانی

---

1 K.Grint. The Sociology of Work an introduction, Singpore, 1991,P.100.

٢ جان بابی، القوانین الأساسیة للأقتصاد الرأسمالي، ترجمة لجنة من شریف حتاته و آخرون، بیروت- لبنان، بدون السنة الطبع، ص٤.

٣ د. علي یوسف خلیفة والسید عدنان مناتي صالح، مجلة البحوث الأقتصادیة والأداریة، العدد الأول، جامعة بغداد- العراق، ١٩٨١، ص ١٢٧.

٤ بیث هس وآخرون، علم الأجتماع، ترجمة الدکتور محمد مصطفی الشعبیني، دار المریخ للنشر، الریاض،١٩٨٩ ص٤٤٠.

ژیانی مرۆڤایەتی هەمیشە لەگۆڕاندا بوون.[5]بەپێی یاساو رێسایەك گەشەیان کردووەو گۆڕاوون.[6] ئەو گەشەکردنەش سستمە ئابوورییەکانیان لێ پەیدابوون کە بەگشتی[*] سێ سستمن(سۆسیالیستی، تێکەڵ، سەرمایەداری)[7].

ئەنترۆپۆلۆجستەکان رایان وایە(ئابووری پێوەری جیاوازیو لەیەك نەچوونی کۆمەڵگاکانە لەڕوی گەشەکردنو پێشکەوتنەوە)[8]. و ئابووری پێوەری رێکخستنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکانە Social Organization لەئەنجامی پێویستییەکانو نەبونییەکانو پەیداکردنەکاندا پەیدابووە لەناو کۆمەڵگا جۆربەجۆرە جیاوازەکاندا[9].

بەڵام ئابووریناسەکان هەندێکیان(ئابووری) بەتاکە فاکتەری گۆڕانکارییەکان دەزانن. هەندێکی تریان(ئابووری) بەهۆیەك لەهۆکانی گۆڕانکارییەکان دەزانن.[10]بۆیە پێویستە بۆچوونی چەند زانایەکی زانستی ئابووری بخەینە ڕوو کەئابووری ئەو زانستەیە کەگرنگی دەدات بەو بەشە چالاکییانەی مرۆڤ(تاكو کۆمەڵ)

---

[5] محەمەد فازل قەفتان، رژێمە ئابورییەکانو کۆمەڵگای تەکنەلۆجی نوێ، بەرگی یەکەم، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٥، ل٣٤.

[6] غليزرمن، قوانين التطور الاجتماعى، ترجمة د. زهير عبدالملك، دار الفارابى- بيروت، ١٩٧٨، ص ٥١-٥٤.

[7]د. محمد علي الليثى، تطور نظم الادارة الاقتصادية في البلاد الاشتراكية، دار الجامعات المصرية- اسكندرية، ١٩٧٤، ص٣.

[8] د. قيس النورى، الأنثروبولوجيا الأقتصادية، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، مطابع الموصل، ١٩٨٩، ص٩.

[9] هەمان سەرچاوە، ل ١٩-٢١.

[10] بەیاد عەبدولقادر، دەروازەی گۆڕانی کۆمەڵ، چاپخانەی الحوادث، بغداد، ١٩٨٧، ل٦٣.

کەتەرخانی دەکات بەگەیشتن بەچاکترین شێوەی شمەك کەببێتە مایەی خۆشگوزەرانی[11]. یا ئەو زانستەیە کەباس لەو هەموو جموجۆڵو چالاکییانەی مرۆڤ دەکات لەڕوی(هۆکانی بەرهەم هێنانو کردارە ئابووری)یەکانەوە، کەسوودبەخشنو ئامانجیان تێرکردنو پڕکردنەوەی زۆرترینی پێداویستییەکانەو بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی (تاكو کۆمەڵ)ە بۆ گەیشتن بەچاکترین شێوەی ژیان[12]. لەسەدەی حەوتەمی پێش زاییندا سستمی کۆیلایەتی بەشێوەی کلاسیکی لەکوردستاندا نەبووە بەڵکو شێوەی دەوڵەتی کۆیلەداری هەبووە، لەگەڵ دوو چەشنە موڵکداری کە(موڵکداری دەوڵەتو موڵکداری تێکڕایی)بوون[13].

ئەگەر بێینە سەر باسی ژیانی ئابووری کۆمەڵگای کوردەواری بەگشتیو کۆمەڵگای هەورامان بەتایبەتی، ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کەژینگەی سروشتی(جوگرافی)کاریگەری هەبووە بۆ سەر ژیانی ئابووری ئەم کۆمەڵگایە.

سروشتە جوگرافییەکەی هەورامانو سەرچاوە ئابورییە دیاری کراوەکانیو دابڕانو دورە پەرێزی کۆمەڵگاکەو پێویستییە بایۆلۆجیو کۆمەڵایەتیو ئابورییە جۆربەجۆرەکانیو هەوڵدانو تێکۆشانی بێ وچانی تاکەکانی کۆمەڵگاکە بۆ بەدەست هێنانی سستمێکی ئابوری تایبەتمەند بۆ کۆمەڵگاکە رێك دەخات کە(سستمی خۆبژێوی) یە کەپشتی بەفرە رۆڵیو فرەکاری بەستوە، چونکە هەریەك لەو کارانەو

---

[11] د. السيد محمد بدوي، في علم الاجتماع الأقتصادي، دار المعرفة الجامعية الأسكندرية- مصر، بدون سنة طبع، ص١٥.

[12] فؤاد حنا دودة، الموجز في مبادئ الأقتصاد، مكتبة النهضة- بغداد، ١٩٦٢، ص٥.

[13] د. عبدالرحمن قاسملۆ، کوردستانو کورد، و. عبدالله حسن زادە، بێ چاپخانە، ١٩٧٣، ل١١٥.

لەو رۆڵانەی کەئەندامەکانی کۆمەڵگاکە دەیبینن پەیوەندیی بەوانی ترەوە هەیەو تەواوکەری یەکترن‌و یاساو رێسایەك پێك دێنن کە بەپێی یاساو رێساکانی گەشەکردن‌و گۆڕان پەیدابوون.

بەڵام ئەگەر بێتو بەووردی سەرنجی سستمی ئابوری کۆمەڵگای هەورامان بدرێت سستمی ئابوری ئەو کۆمەڵگایە(سێ جۆر موڵکایەتی)تیابەدی دەکرێن، چونکە لەلایەکەوە بەشێك لەزەوی‌و زاری هەورامان موڵکایەتی‌یەکەی موڵکداری گشتی تێکڕایی‌یەو دەوڵەت خاوەنی راستەقینەی ئەم جۆرە موڵکداری‌یەیە بەپێی یاسا، وەك چەم رشاخ‌و لەوەڕگا گشتی‌یەکان- مرعی. بەشێکی تر لەزەوی‌و زاری هەورامان موڵکایەتی‌یەکەی تایبەتە، بەچەشنێك هەموو کەسێك‌و هەموو خێزانێك مافی خاوەندارێتی‌ی تایبەتی هەیە وەهەر کەسێك توانای هەبوبێت بوەتە خاوەنی زەوی‌وزار یاخاوەنی هەرشمەکێکی‌تر کەپێویستی بوبێت لەژیاندا، ئەمەش وەك خاوەنداریەتی یا موڵکایەتی(زەوی، باغ، کەلوپەلی تری بەرهەمهێنان.. هتد). ولەلایەکی ترەوە موڵکایەتی تێکەڵ لەهەوراماندا دەردەکەوێت کەخاوەنداریەتی‌و موڵکایەتی‌ی شمەك یاکەرەستە، لەلایەکەوە موڵکی دەسەڵاتدارەکان(سان‌و بەگ و خان‌و شێخ)بوە، بەنیوەکاری یا بەرێژەیەك کە لەسەری رێککەوتون خەڵکە بێ دەسەڵاتەکە بەرهەمیان هێناوە کە(پشك- بەش)ی تیا بوە، واتا ئەم جۆرە موڵکداری‌یە بەشێکی بۆ خاوەن دەسەڵاتەکان دەگەڕێتەوەو بەشەکەی تری بۆ بێ دەسەڵاتەکانە بەپێی پشکایەتی. بەو جۆرە لەسستمی ئابوری کۆمەڵگای هەوراماندا(هەر سێ جۆرە موڵکایەتی‌یە)کە بەرچاو دەکەون.

بەڵام بەشێوەیەکی زۆر ساکارانە بەڕێوە چونو سەپێنراون، ئێستا لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا(خاوەنداریەتی تایبەت)زۆرتر پەیڕەو دەکرێت.

ژیانی ئابوریی کۆمەڵگای هەورامان لەسەر چەند جموجۆڵو چالاکییەك دامەزراوە وەك(کشتوکاڵ، پیشەسازی، بازرگانی، کانزاکردن، گەشتو هاوینەهەوار)، هەروەها ئێستا لەکۆمەڵگای هەوراماندا کارگێڕی بەشدارە لەژیانی ئابووریی کۆمەڵگاکەدا هەرچەندە کارگێڕی یەکێکە لەپێکهێنەرەکانی سستمی کۆمەڵایەتی. کەهەر یەکە بەجیاو بەکورتی باسیان دەکەین.

## ١-کشتوکاڵ

کشتوکاڵ لایەنێکە لەلایەنەکانی پێکهاتەی ژیانی ئابووریو بەڕواڵەتێکی گرنگی ژیانی ئابووری دەژمێردرێت کە لەسەردەمێکی مێژووییدا پیشەی هەرە گرنگی مرۆڤ بووە کەژیانی لەسەر دامەزراوە، بەگشتی کشتوکاڵ دەکرێت بەدوو بەشەوە بەشێکی رووەکەو بەشەکەی تری ئاژاڵو باڵندەیە[١٤] سێ توخمی سەرەکی جگە لەمرۆڤ فاکتەری بنەڕەتی کشتوکاڵن کەئەمانەن(هەوا، خاك، ئاو)[١٥]. ئەو توخمانەش کاریان کردوەتە سەر جیاوازی کشتوکاڵ لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر[١٦]. ئەوانەش کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر دیاری کردنی جۆری کۆمەڵگاکان رئاستی پێشکەوتنیانو جیاوازی کۆمەڵگاکانی

---

[١٤] د.شاکر خصباك، العراق الشمالي دراسة للنواحي الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق- بغداد، ١٩٧٣، ص٣٢١.

١٥ د.قيس النوري، الأنثروبولوجيا الاقتصادية، المصدر السابق، ص٢٢.

[١٦] د.فاروق اسماعيل، الانثروبولوجيا الثقافية دراسة حقلية في الثقافات الفرعية، دار المعرفة الجامعة- اسكندرية ١٩٨٩-ص٧٨.

مرۆڤایەتی کەبەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیون[17]. بێگومان چالاکی‌یەکانی مرۆڤ پەیوەندیان هەیە بەسەرچاوە ئابوری‌یە سروشتی‌یەکانەوەو بەئامرازەکانی بەرهەم هێنانەوەو بەداب‌و نەریت‌و خووڕەوشتی باوی کۆمەڵگاکانەوە[18].

هەروەها سستمی ئابوری جیاناکرێتەوە لەسستمەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی، بەڵکو کار لەیەکتردەکەن‌و بەیەکەوە بەسراون، هەچ گۆڕانێك لەلایەنێك لەلایەنەکانی سستمی ئابووری روبدات سەرپاکی دەگرێتەوەو ئەویش کاردەکاتە سەر سستمەکانی ترو ژیانی کۆمەڵایەتی‌و کۆمەڵگاکە دەگۆڕێت[19]. لەکوردستانی عیراقدا پاشماوەی مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن لەچەند ئەشکەوتێکدا دۆزراوەتەوە کەبەڕاوو شکاری ئاژەڵە کێویی‌یەکان ژیاون، دواتر هەندێ ئاژەڵیان دەستەمۆ کردووەو دۆستایەتی‌یان لەگەڵدا پەیداکردوون‌و ماڵییان کردوون[20] بەدوای ئەو قۆناغەدا مرۆڤ لەکوردستانی عیرقدا بۆ یەکەم جار نیشتەجێ‌بوەو دێی سەرەتایی دروست کردوە، ئەوەش کاتێك بوە کەکار دابەشکردن پەیدابووە لەنێوان(نێرو مێ)دا. نێرەکان خەریکی راوو شکار بوون مێکانیش خەریکی چنین‌و رستن بوون‌و منداڵیشیان

---

17 د. ابراهيم ناصر، الانثروبولوجيا الثقافية علم الانسان الثقافي، دار الكرمل للنشر والتوزيع-عمان-الاردن، ١٩٨٥، ص١٥٦.

18 د.فاروق مصطفى اسماعيل، الانثروبولوجيا الثقافية، ج١، دار المعرفة الجامعية-اسكندرية، ١٩٨٤، ص٢١٦.

19 د.قيس النوري، الانثروبولوجيا الاقتصادية، المصدر السابق، ص١١.

20 نخبة من الباحثين العراقيين، حضارة العراق، الجزء الاول، دار الحرية للطباعة- بغداد، ١٩٨٥، ص٢١.

بەخێوکردووە[21] ئافرەت زۆرتر لەپیاو عەودالّی بەروبومی دارو درەختو گژوگیا بووە. بۆیەکا واپێ دەچێت کشتوکالّ- یەکەم بەردی گەورەی بناغەی شارستانەتیی مرۆڤ- بەرهەمی بیری ئەوبێت کەدیسان واپێ دەچێت ئەوسا بیری لەبیری پیاو تیژتر بوبێت[22].

کشتوکالّ کلتورو ژیاری مرۆڤە کەبەرهەمی ئاوێتەبونی مرۆڤو ژینگەی سروشتییەو گەلی کورد زۆر لەکۆنەوە پیشەی کشتوکالّ کردنو ئاژەلّ بەخێوکردنو راگرتنی زانیوە[23] کەواتە لەدێرزەمانەوە گەلی کورد (جێگیر)بوەو نیشتەجێ بووە بەپێی رای شوێنەوارناسەکان یەکەم دێی کشتوکالّی دێی(چەرمو- چەرمە)بوە لەنزیك چەمچەمالّ کەمێژووەکەی بۆ نزیکەی(نۆ هەزار سالّ) لەمەوبەر دەگەڕێتەوە[24] لەو سەردەمە بەدواوە مولّکایەتیو خاوەنداریەتی پەیدابووە هەرچەندە جۆری خاوەنداریەتییەکە بەتەواوی دیاری نەکراوە.

زۆرتر مەبەست لەجێگیربوونو خۆپاراستنو پێشکەوتنی ئاستی ژیری بووە کەمرۆڤی کورد دەرکی پێ کردوە لەو سەردەمە مێژووییەدا. ئەوەش وەرچەرخانێکی گەورە بوە کەمرۆڤی کوردی گۆڕیوە لەقۆناغی راوشکارەوە بۆ قۆناغی کشتوکالّ کردنو جێگیربوون. وەخاوەنداریشو مولّکایەتیش لەو سەردەمەدا پەیدابووە.

---

[21] نخبة من الباحثين العراقيين، حضارة العراق، المصدر السابق، ص١٢٠.

[22] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ئافرەت لەمێژوودا کورتە باسێکی مێژوویی‌و کۆمەلاّیەتی، چاپخانەی الحوادث- بەغدا ١٩٨١، ل٦.

[23] أ. شاميلوف، حول مسالة الاقطاع بين الكرد، ترجمة د. كمال مظهر أحمد، مطبعة الزمان- بغداد، ١٩٧٧، ص٣٥.

[24] عبدالرقيب يوسف، شوێنەوارەکانی نەوێ لەشاخی سورێن، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان، ١٩٩٤، ل٥٧.

ئەگەر بەگشتی مێژووی مرۆڤایەتی بخرێتەپێش چاو دەردەکەوێت کەلەو سەردەمەدا ئابوری غەمی سەرەکی ژیان نەبو[25]. بەڵکو جێگیر بوونو نیشتەجێ بوونو مەبەست بووە.

کۆمەڵگای هەورامان وەك بەشێك لەخاكو نەتەوەی کورد بەپێی ژینگە جوگرافییەکەی کەهەمووی شاخو بەردەڵانە سەدان ئەشکەوتی قوڵی تیابووە، تائێستا نەپشکێنراون، سەرپاکی ناوچەکە بەدارو درەختی بەرهەم دارو جۆرەها گژوگیای بەسود داپۆشراوە بێگومان ئەوانە بونەتە لانکەی ژیان لەسەردەمە کۆنەکاندا. هەورامییەکانی ئێستا وەچەی ئەوانن کە لەو سەردەمەدا ژیاون هەرچەندە ئاسەواری چەند دێیەکی هەورامان بۆ سەردەمی مادەکان دەگەڕێتەوە[26]. بەڵام پێش ئەوەش چۆڵ نەبووە، چونکە شاخەکان بەربەستێکی سروشتی بوون بۆ پاراستنیانو دابینکردنی ئاسایش، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە شاخەکان مەڵبەندی روەکە خۆڕسکە بەرهەمدارەکان بوون کەسەرچاوەی ژیانن، هەروەها ئاوی زۆرو هەوای سازگارو زۆری جەنگەڵەکانی یارمەتیدەر بوون بۆ نیشتەجێبوونو جێگیربونو دێ دروست کردن.

کاتێك کەنیشتەجێ بون پەرەی سەندووە ژمارەی دانیشتوان زیادی کردوە دێکان گەورە بورن جۆری گژوگیاو روەکەکان ناسراون کار دابەشکردن پەیدابووە لەنێوان(نێرو مێ)دا نێرەکان خەریکی ئیشو

---

[25] ئێریك فرۆم، مرۆڤ لەنێوان رواڵەتو جەوهەردا، و: سابیر بەکر بۆتانی، چاپی دووهەم- سلێمانی، چاپخانەی شڤان ٢٠٠٤، ل٦٣.

[26] ئی. م. دیاکۆنۆف، میدیا، وەرگێڕانی بورهان قانع، دار الحریة للطباعة، بەغدا، ل٢٣٢-٢٣٣.

کاری دەرەوە بونو مێیەکانیش جگە لەمنداڵ بەخێوکردن خەریکی چنینو رستنو ئاژەڵ راگرتنو دووریش نیە کشتوکاڵ لەسەردەستی ئەوان پەیدابوو بێت[٢٧].

ئەگەرێتوو بەووردی سەرنجی خەڵکی کۆمەڵگای هەورامان بدەین دەبینین زۆر کارامەن لەناسینی گژوگیا بەسوودەکان چ بۆ خۆراك چ بۆ دەرمانسازی، هەروەها ژەهراوییەکانیشیان ناسیون، لەناسینی دارو درەختدا شارەزاییی زۆریان هەبووە کەکامەیان بەرهەمدارەو کامەیان بۆ خانوبەرە دروستکردن دەست دەداتو کامەیان بۆ پیشەسازییەو کامەیان بۆ سوتاندن دەشێت.

جگە لەوە زۆر شارەزان لەناسینی ئاژەڵو باڵندە کێوییەکاندا ئەوانەیان سوودبەخشنو ئەوانەشیان کەدڕندەنو زیان بەخشن بەناو ویەشێوە(رواڵەت)دەیانناسن، هەروەها دەزانن کام ئاژەڵەو کام باڵندەیە ماڵی دەبێتو کامەشیان ماڵی نابێت.

ئەوانە هەموو بەڵگەو ئاماژەن کەهەورامییەکان بەقۆناغەکانی ژیانی ئابووریدا تێپەڕیون لەو ژینگە جوگرافییە سروشتییەدا.

لەبواری کشتوکاڵ کردندا بەهۆی ژینگە جوگرافییەکەوە زۆرتر رەزو باخ بەرهەم هێنراوە لەهەوراماندا جگەلەوە لەدامێنی چیاکانو لەدۆڵەقوڵەکاندا بەهۆی لافاوەوە چەند جۆرە دەشتێکی لاکێشەییو تەسكو باریك لەم بەرو لەوبەری چەمەکاندا دروست بوون کەخاکەکەیان بەپیتو پڕ لەکانزایە، هەندێك کشتوکاڵیان لێ دەکرێت کە(بەشێکی هاوینەو بەشێکی زستانە)بووە. وەلەبەر کەمی زەوی

---

[٢٧] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ئافرەت لەمێژوودا کورتە باسێکی مێژوویيو کۆمەڵایەتی، سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

کشتوکاڵی، هەورامییەکان زەوییەکانیان بەپەینی ئەندامیو بەشەوەرو وێنجەکردن بەهێز دەکەنەوە چونکە زەوییەکانیان هەمیشە بەبەرەوەنو نۆرەیان پێ ناکرێ.

ئاژەڵداری لەهەوراماندا کەمە چونکە ژینگە جوگرافییەکەی رێگرەو یارمەتیدەر نییە بۆ ئاژەڵداری، هەروەها خۆراكو ئالیکی ئاژەڵو شوێنی راگرتنی(گەوڕ) بەئاسانی دەستەبەر ناکرێن ئەرك و ماندوبونێکی زۆری دەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئاژەڵداری کەم کە لەچەند سەرێك تێپەڕ نەکات بەخێو دەکرێتو راگیر دەکرێت بەتایبەتی ئەو ماڵاتەی کەخاوەن زەوی‌وزارو خاوەن خێزانێکی زۆرن.

هەروەها لەکۆمەڵگای هەوراماندا باڵندەو پەلەوەریش بەکەمی بەخێودەکرێن کە لەگەڵ ژینگەی سروشتی هەوراماندا دەگونجێن. دەتوانین بەگشتی کشتوکاڵ لەهەوراماندا بکەین بەسێ بەشی سەرەکییەوە کەئەمانەن:-

أ-بەروبومە روەکییەکان: بەروبومە روەکییەکان بەگشتی لەهەوراماندا دوو بەشن(خۆرسك، چاندن- بەرهەمهێنراو).

خۆرسك: ئەو بەروبومە روەکییانەن کەبەبێ دەستی مرۆڤ دەڕوێن لەژینگەی جوگرافی هەوراماندا ئەو فاکتەرانە کەیارمەتیدەرن بە(بەپیتی خاکەکەیو گونجاندنی ئاووهەواکەیو زۆری رێژەی بارینی بەفروباران)، بەروبومە روەکییە سروشتییە بەناوبانگەکانی هەورامان وەك(داری بەڕوو، مازوو، داری قەزوان، داری گۆیژ، بەلاڵوك، چوالە، هەرمێ کێویلە..هتد).

جگەلەمانە کۆمەڵێك گژوگیای سروشتیش چ بۆ دەرمانسازی یا بۆ خۆراك لای هەورامییەکان ناسراوەو کۆدەکرێتەوە وەك(کنگر، گێلاخە،

روسقه، پیژۆك، گەبڵە، گۆزروان، سەیاران، هاڵكۆك، شنگ، كنیواڵ، قارچك، دومەڵان، خەرتەلە، تۆڵەكە، هاز...هتد) بەشێكی تریشیان دەچنە ئالیكی ئاژەڵەوە وەك(هەڵس- لۆ، كەما، سێپەڕە، جۆكێویلە) وەهەندێكی تریان بۆ دەرمانسازی بەكاردەهێنرێن وەك(بەڕەزا، قەیتەران، بەرزەلنگ، چنور، شەوبۆ، وەنەوشە، گیا سۆیا، جاترە، كوزەڵە، بەنۆڵە، پونگە،...هتد)هەندێكی تریش بۆ رازاندنەوەو جوانی بەكاردەهێنرێن وەك(گوڵەباخ، شروە هەلاڵە، هەلاڵە برەمی، گوڵە حاجیانە،...هتد).

چاندن- بەرهەمهێنراو: ئەو بەروبومانەن كەهەورامییەكان دەیچێنن‌و بەرهەمی دەهێنن بۆ پڕكردنەوەو تێركردنی پێویستی‌یەك لەپێویستی‌یەكانی رۆژانەیان كەگرنگترینیان ئەمانەن(دارودرەخت- گوێز ٦٠٠٠دار[28]- ٦٠٠٠٠دار[29]، توو، هەنجیر، مێو، رەز، هەڵوژە، بەهێ، هەرمێ، قۆخ، هەنار، قەیسی، گێلاس، بی، سپی چنار، سورە چنار، شاتوو...هتد)هەروەها هەندێكی تر كەخۆراكی سەرەكین وەك((گەنم، جۆ، گەنمەشامی، كونجی، گوڵەبەڕۆژە، نۆك، نیسك، ماش، فاسۆلیا، عەلی بابا، پاقلە)هەندێ تەڕەو سەوزەش وەك(بامیە، تەماتە، پەتاتە، خەیار، ترۆزی، پیاز، سلق، شێلم، چەوەندەر، كولەكە، باینجان، بیبەر، ...هتد)

ب-بەروبومە ئاژەڵی‌یەكان:- ئەو ئاژەڵانەی كە لەگەڵ ژینگەی جوگرافی هەوراماندا دەگونجێن‌و هەڵدەكەن بەگشتی دوو بەشن(ئاژەڵە كێوی‌یەكان، ئاژەڵە ماڵی‌یەكان).

ئاژەڵە كێوی‌یەكان: گرنگترین ئەو ئاژەڵانەی كەكێوین‌و لەگەڵ ژینگەی هەوراماندا راهاتون‌و دەژین ئەمانەن(مەڕوبزنی كێوی، كەروێشكی كێوی، رێوی، وورچ، بەراز، چالەكە، ژیژك، سوچەڕ، سمۆرە،

---

[28] د. شاكر خصباك، العراق الشمالي، المصدر السابق، ص٣٩٤.

[29] محمد مصطفى أحمد، بيارة، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة، صلاح الدين،١٩٩٤، ص٦٥.

پشیلەی کێوی). و هەندێکی تر کەدڕەندەو مەترسیدارن وەك(گورگ، پڵنگ، چەقەڵ، دەڵەك، بەوەرز).
ئاژەڵە ماڵییەکان:گرنگترین ئەو ئاژەڵانەی کەماڵین و لەگەڵ ژینگەکەدا دەگونجێن هەورامییەکان رایان دەگرن ئەمانەن، باربەرەکان وەك(ئێستر، گوێ درێژ). ئەوانەش کەبۆ شیرەمەنیو گۆشتو خوری رایان دەگرن وەك(مەڕ، بزن، مانگا). هەروەها بۆ پاسەوانی وڕاوکردن(سەگو تانجی)رادەگرن.
ج-باڵندەو پەلەوەر: ئەو باڵندەو پەلەوەرانەی کە لەهەوراماندا لەگەڵ ژینگە جوگرافییە سروشتییەکەیدا دەگونجێن بەگشتی دووبەشن(باڵندەو پەلەوەرە کێوییەکان، باڵندەو پەلەوەرە ماڵییەکان).
باڵندەو پەلەوەرە کێوییەکان: لەهەوراماندا چەندین جۆر باڵندەو پەلەوەری کێوی هەیە کەهەندێکیان هەمیشەیین هەندێکیشیان وەرزین، هەمیشەییەکان وەك(داڵ، کەو، سوێسکە، هەموو جۆرە چۆلەکەیەك، کۆتری کێوی، قەلەڕەش، قەلەباچکە، پۆڕ، کوندەپەپوو، بایەقووش.. هتد) وەهەندێکی تریش ساڵانە لەوەرزێکدا کۆچ دەکەنو بۆ ماوەیەك دەمێننەوە لەهەوراماندا وەك(لەق لەق، پەڕەسێلکە، عەینەمل، پەپوسلێمانە، قژاڵکە، کەنەسمە ...هتد).
باڵندەو پەلەوەرە ماڵییەکان: گرنگترین ئەو باڵندەو پەلەوەرانەی کە لەهەوراماندا رادەگیرێنو ماڵی دەکرێن وەك(مریشك، قەل، قاز، مراوی، کۆتر، هەنگ). هەندێ(مێروو)ی زیان بەخش لەهەوراماندا دەژین کە لەگەڵ ژینگەکە هەڵدەکەن وەك(مار، دوپشك، جاڵجاڵۆکەی ژاهراوی، جاڵجاڵۆکەی ئاسایی، هەموو جۆرە مێروولەیەكو چەندین جۆر کرم، چەند جۆرێك کوللە، سون). بەگشتی کشتوکاڵ کردن لەهەوراماندا بەزۆری(بەراوە)و پشت بەئاوی چەمو جۆگاکان دەبەستێتو بەشێکی کەمیشی بەباراناو.
کشتوکاڵ لەهەوراماندا بەپێی سستمێکی رێكوپێك رێکخراوە کەتایبەتمەندە بەتواناو سەلیقەو ژیریو ووردەکاری خەڵکەکەوە

لەلایەكو لەلایەكی ترەوە بەتۆپۆگرافیای هەورامان، ئەوەی بۆ ساتێكیش سەردانی ئەو ناوچەیەی كردبێت راستەوراست سستمی كشتوكالكردنی هەورامان سەرنجی راكێشاوە بۆ نموونە(ئەدمۆندز) دەڵێت ((ئەندازیارە كشتوكاڵی‌یە بەناوبانگەكەم پێی ووتم، زانستو زانیاری‌یەكانی من هیچی زیاد نی‌یە لەشارەزایی هەورامییەكان لەرووی رێكخستنی ئەندازەیی‌یەوە بۆ مەبەستی ئاودێری‌و جۆگا دروست كردن لەزەوی‌یە شاخاویەكاندا))[٣٠].

رێكخستنی ئەو دیمەنەی هەورامان‌و رازاندنەوەی قەدپاڵی شاخەكان‌و رێكخستنی دۆڵە قوڵەكانی‌و دابەشكردنی ئاوەكانی‌و دروستكردنی ئەو هەموو(تەلان[*] جۆگا[**] بنەوان[***] بەنگا[****])یانە سیمایەكی جوانی بەخشیوە بەناوچەكەو ژینگەكەیان رازاندۆتەوە[٣١].

---

[٣٠] سی. جی. أدموندز، كوردو ترك و عرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بدون مطبعة وسنة الطبع، ص١٥٥.

[*] تەلان:-ئەو پارچە زەوی‌یە تەسكە درێژكۆلەییە كەبەقەد پاڵی چیاكان‌و زەوی‌یە لێژەكانەوە دروست دەكرێن كەپانی‌یان لەمەترێكەوە بۆ پێنج مەترو درێژی‌یان بەپێی روبەرەكە دەگۆرێت، ریزێك یا دووریز درەختی تیا دەروێنرێت كەدوری هەردرەختێك لەوی ترەوە لەدوومەتر زیاترە، ئەوەش ئەركو ماندوبونێكی زۆری دەوێت تاتەخت دەكرێت.

[**] جۆگا:- بریتی‌یە لەرێرەوێكی ئاوی كە لەدرێژی‌و پانیدا جیاوازە بەپێی زۆرو كەمی ئاوو باخەكان كەمرۆڤ دروستی دەكات لەناوچە شاخاویەكاندا بۆ گەیاندنی ئاو لەسەرچاوەوە یان لەبنەوانەوە بۆ سەر كشتوكاڵو باخەكان.

[***] بنەوان:-بریتی‌یە لەهەڵبەستن‌و بەرزكردنەوەی ئاوی چەم‌و روبارەكان لەلایەن مرۆڤەوە بۆ ئاستێك كەجۆگای لێ‌هەڵدەگیرێت بەمەبەستی ئاودان، وەك عەمبارێكی ئاوی بچكۆلە وایە كە لەسەر چەم‌و روبارەكان دروست دەكرێت.

[****] بەنگا:-رێرەوێكی ئاوی‌یە كە لەجۆگاوە هەڵدەگیرێت بۆ دابەشكردنی ئاو بەسەر تەلانەكاندا، زۆرو كەمی ئاوەكەی‌و كورت‌و درێژی بەنگاكە بەپێی تەلانەكان دیاری دەكرێت.

[٣١] د. شاكر خصباك، العراق الشمالي، المصدر السابق، ص٢٥٧.

هەروەها فاکتەرە سروشتی‌یەکان‌و دڵسۆزی‌و وردەکاری خەڵکەکە لەکارکردنیاندا کاریگەری‌یان هەیە بۆ دیاریکردنی جۆرەکانی بەرهەم‌و بەرووبومی کشتوکاڵی"[٣٢].

کشتوکاڵ لەهەوراماندا بەشێوەی گەلکاری‌و یارمەتیدان‌و هاریکاری کردنی یەکتری دەکرێت ئەوەش دەبێتە فاکتەرێك بۆ تێکەڵ بوون‌و یەکترناسین، هەروەها نێرومێ بەشداری دەکەن لەو پرۆسەیەدا بەبێ جیاوازی، ئەوەش کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە لەسەر پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان‌و ژیانی کۆمەڵگاکە، کەپەیوەندییەکان توندوتۆڵ دەبن‌و گیانی خۆشەویستی‌و یارمەتیدان بەهێز دەبێت لەکۆمەڵگاکەداو لەخۆشی‌و ناخۆشی یەکتر هاوبەشی دەکەن‌و بەهانای یەکترەوە دەچن‌و یارمەتی یەکتر ئەدەن، چونکە پەیوەندییەکانیان روبەڕون‌و هەمیشەیین‌و توندوتۆڵن ئەوانەش دەبنە هۆی یەکگرتنی کۆمەڵگاو سستمێکی کۆمەڵایەتی تایبەت پەیدا بووە کەیەك کار لەوی تر دەکات‌و تەواوکەری یەکترن هەچ گۆڕانێك روبدات لەیەکێك لەپێکهاتەکانی سستمەکەدا تێکڕای کۆمەڵگاکە دەگۆڕێت.

### ٢- پیشەسازی

بێگومان کشتوکاڵ کردن، پێویستی بەئامرازی بەرهەم هێنان هەیە جا ئەو ئامرازانە لە(دار یا لەبەرد یا لەکانزاکان) دروست کراون‌و بەدرێژایی مێژوو بەپێی پێویستی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، کەهەموو ئامرازو کەرەستە جۆربەجۆرەکانی بواری بەرهەم هێنان

---

[٣٢] د. شاكر خصباك، الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٢، ص٢٨٤.

دەگرنەوە کەپێویستن بۆ ژیان لەکاتی ئاشتیو شەڕدا، لەکۆنو نوێدا[٣٣].

تێکڕا پیشەسازی دوو جۆرە: پیشەسازی سووك(سەرەتایی-دەستییەکان)، پیشەسازیی قورس(کارگە) وەهەریەك لەوانە خەسڵەتی تایبەتی خۆیان هەیە[٣٤] ئەمەش هەمیشە لەگۆڕاندایە چونکە گۆڕان راستییەکەو هەر ئەبێ روودەدات، جگە لەوەی دیاردەیەکی گشتیو تایبەتییە لەژیانی کۆمەڵایەتیدا[٣٥]. هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان روبەڕوی دیاردەی گۆڕان دەبنەوە، هیچ کۆمەڵگایەکیش نییە شێوەیەك لەشێوەکانی پیشەسازی نەکردبێت[٣٦] هەموو کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوای جەنگی جیهانی دووەم روبەڕوی گۆڕان بونەوە لەسەر داواکارییەکانی ناوەوەو دەرەوە جا ئەو گۆڕانە لەسەرخۆ یا بەخێرایی رو ئەدات[٣٧].

کۆمەڵگای هەورامان ژینگە سروشتییەکەیو تۆپۆگرافیاکەیو روداوە رامیارییەکانی دەوروبەریو پێویستییە زۆرەکانی خەڵکەکەی بۆ درێژەدان بەژیان هاندەربوون کەهەر لەسەرەتای پەیدابونیدا لەپاڵ

---

[٣٣] د.محمد عبدة محجوب، مقدمة فی الانثروبولوجیا المجالات النظریة والتطبیقیة، دار المعرفة الجامعیة-أسکندریة، بدون سنة الطبع، ص ١٣٤-١٣٨.

[٣٤] د.علی محمود اسلام الفار، علم الأجتماع الصناعی، دار المعارف بمصر، ١٩٧٨، ص٩١، ١٣٥.

[٣٥] فهمی سلیم الغزوی و آخرون، المدخل الی علم الأجتماع، دار الشروق-عمان، ١٩٩٢، ص٢٨٥.

[٣٦] د.مجید حمید عارف، أنثروبولوجیا التنمیة الحضریة، وزارة التعلیم العالی والبحث العلمی، ١٩٩٠، ص٦٧.

[٣٧] د.محمد الجوهری وأخرون، دراسات في التغییر الأجتماعی، دار المعرفة الجامعیة-القاهرة، بدون سنة طبع، ص٢١٣.

کشتوکاڵ کردندا پیشەسازیش بکەن، بۆ پڕکردنەوەی پێویستی‌یەکانی کشتوکاڵو بەرهەم هێنان کە لە(دارو لەبەردو لەکانزاکان)کەڵك وەرگیراوە لەپیشەسازی‌دا ئەوەش لەچەندین بواری جۆربەجۆردا ڕەنگی داوەتەوە وەك پیشەسازی کردن لەبواری(کشتوکاڵو چنین‌و ڕستن‌و ڕیێستەو چەرم‌و کەلوپەلی ناوماڵو کەرەستە خۆراکی‌یەکانی‌و ڕاوو شکارو بەرگی‌و جەنگدا). بۆ هەر پیشەسازی‌یەك لەو پیشەسازی‌یانە دەستەی تایبەتی کارکردن‌و کرێکارو وەستای تایبەتیان هەبوە کەبەخێزان‌و ماڵو منداڵەوە لە(ناوماڵەکاندا)پیشەسازی‌یان کردووە، دواتر جێگای کارکردنیان گواستوەتەوە بۆناو(دوکان‌و کورەخانەکان‌و شوێنەکانی‌تر)کەکاریان تیاکردوە بەڵام(کارگەو کارخانەو کۆمپانیا) لەهەوراماندا دانەمەزراوە، چونکە ژینگە سروشتی‌یەکە ڕێگربووە لەپەرەسەندن‌و گەشەکردنی پیشەسازی‌دا. ئەوانەی کە لەو پیشانەدا کاریان کردوە بەپیشەکانیانەوە ناسراون بەتاك‌و بەخێزان‌و بەبنەماڵەوە وەك ووتراوە(دارتاشەکان، جۆلاکان، ئاسنگەرەکان، چەخماخ سازەکان، پێڵاودروەکان- کلاش کەرەکان، ڕەنگ چییەکان- خومچی‌یەکان، سەرتاشەکان، زەرەنگەرەکان، کەوشەوانەکان- ڕاوچی‌یەکان، حەکیمەکان، وەستاو بەناکان... هتد). هەرکەسێك کە لەیەکێك لەو پیشەسازیانەدا کاری کردبێت پیشەی تریشی هەبووە، خێزان یا بنەماڵەی وا هەبووە کە لەچەند پیشەسازی‌یەکدا کارامە بوون‌و دەستێکی باڵایان هەبوە، وە بەچەند پیشەیەکەوە ناسراون.

بۆ نموونە زۆری خەڵکی(تەوێڵە) پیشەسازن پیشەسازی‌یەکەیان (پیشەسازی دەستی‌یە)، جگەلەوەی باخیشیان هەیە[٣٨]. لەخانەقاکەی

[٣٨] سی.جی. أدموندز، کردو ترکو عرب، المصدر السابق، ص١٥٥.

بیارەدا عووروسییەکی داری نەخشینی بەشوشەی رەنگاورەنگ دروست کراوە[٣٩]. هەروەها دێیەکانی هەورامان بەتایبەتی (تەوێڵەو بیارەو باخەکۆن) پێشکەوتووبوون لەپیشەسازیو بازرگانیو باخ بەرهەم هێنانو خانووبەرەدا[٤٠] خانووەکانی تەوێڵە یەکجار رێكو پێك کرابوون. زۆریان بەبەردی رەنگاورەنگی شاخەکە بەووشکەکەڵەك* دروست کرابوون. خانوویەکی سێ نهۆم لەتالەتکاری پەنجەرەدا پڕە لەناوێنەکاری، میناباەندیش کراوە، پیاو بەڕاستی کەبەراوردی لادێکانی(شارباژێرو هەورامان)ئەکات سەری سوڕ ئەمێنێ، ئەم خانوانە لەشاریشدا کەم وێنەیان هەیە[٤١] بۆ بەهێزکردن وبەستنەوەیو پتەوکردنی دیوارەکانی دیمەك** بەکارهاتووە[٤٢].

لە(تەوێڵە) قەیسەریەك، سێ چوار چایخانە، چەند دوکانێکی تر، دوو سێ سەرشۆرگ(حەمام)، خانەقایەك، دوومزگەوتی زۆر نایاب، کلاش دروو، چەقۆکەر، ئاسنگەر، دارتاشی یەجگار هونەرمەند، ١٥

---

[٣٩] عبدالرقیب یوسف، بانگەوازێك بۆ روناکبیانی کورد، چاپخانەی کامەرانی- سلێمانی، ١٩٨٥، ل٨٢.

[٤٠] شاکر فتاح، رۆژنامەی خورماڵ، چاپخانەی- الحوادث- بغداد، ١٩٨٣، ل٤.

* ووشکە کەڵەك: دیواری خانوو بەبێ بەکارهێنانی چیمەنتۆو گەچو قوڕ کەتەنها بەبەرد دروست دەکرێت.

[٤١]شاکر فتاح، گەشتی هەڵەبجەو هەورامان، چاپخانەی کامەرانی- سلێمانی، ١٩٧٣، ل٣٣-٣٤.

** دیمەك:- پارچەیەکە لەدار کەدارتاشەکان دەیتاشنو رێکی دەخەن، درێژی لەیەك مەتر بۆ دوو مەترو پانیەکەیو بەرزیەکەی لە٢٠-٣٠سم دەبێت بۆ راگرتنو قایم کردنو توندوتۆڵ کردنی دیواری خانوو سەرپەنجەرەو سەردەرگا بەکاردەهێنرێت.

[٤٢] هادی رشید چاوشلی، الحیاة الاجتماعیة في کوردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد ،١٩٧٠، ص٩٤.

مەکینەی بەرگدورووی تیابوو، کڵاشی قۆندەرئاسا، پۆتینی دەزووی نایاب، چەقۆی یەجگار ناسك و جوان، داردەستی زۆر رەنگین، کەوچك و شەکردانی چاك، خوا زیرەکی یەکی گەورەی پێ بەخشیون لەبەرئەوە چاوی کوردی ئەم ناوە زۆرکراوەتەوە، جێ و بانیان زۆرپێش کەوتوە[٤٢].

**کەرەستە خاوەکانی پیشەسازی لەهەورامانـدا**

تێکڕا پیشەسازی یەکانی کۆمەڵگای هەورامان دەستێن و لە چوار کەرەستەی خاوی سروشتی دروست دەکرێن و دەبن بە دوو بەشەوە ئەویش بەم جۆرە:-

أ-بەرد: هەندێك لەپیشەسازی یەکان کەرەستە خاوەکەیان لەجۆرە بەردێك پێکهاتووە کەبەردتاشەکان دەیانناسن و کەرەستەیان لێ دروست دەکەن. ئەو پیشەسازی یانەی لەبەرد دروست دەکرێن وەك(بەرداش و دەستهاڕ و بانگردێن و هێلەساوە و ئاوان- دۆڵ و هەسان و سەنگی کێشانەو پێوانە ...هتد).

ب-دار:- بەشێکی یەکجار زۆری پیشەسازی یە دەستی یەکانی هەورامان کەرەستە خاوەکانیان دارە، بۆهەر پیشەسازی یەك جۆرە دارێك بەکاردەهێنرێت کەدارتاشەکان دەی ناسن. پیشەسازی یە داری یەکان وەك(کەوچك، شانە، سەبەتە، تەیکە، لەنگەری، مەن، کاسە، هەزارپێشە، یەغان- سندوق، بەفرماڵ، دەسکی ئامێرە کشتوکاڵی و بڕەرەکان، سێلك، شەن، هێڵەك و کەم و بێژنگ، تەختەی خێزەرە بۆ دارەڕا، داری دارەڕا، دیمەك، دەرگا، پەنجەرە، بێشکە، پنەو تیرۆك، کورسی، تەشی، شەکردان، نانەشان، کیتەڵە، دەفر، هەموو جۆرە تەشتێکی دارین..هتد).

---

[٤٢] شاکر فەتاح، گەشتی هەڵەبجەو هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

ج-چەرمو خوری ئاژەڵ:-بەشێك لەپیشەسازییە دەستییەکانی هەورامان کەبۆ کەلوپەلی ناوماڵو لەبەرکردنو لەپێکردن بەکاردەهێنرێ، کەرەستە خاوەکەیان چەرمو خوری ئاژەڵە وەك(خامینە- جۆرە پێلاوێکی چەرم بوە، کلاش، قایش، کوندە ومەشکەو هیزە، جلو بەرگی لەبەرکردن بۆ نێرومێ، مەوجو جاجمو بەرماڵو هەموو جۆرە پێخەفێکی‌تر، گوریسو قەیاسەو زینو رەشوەو خەرارو رەشکە...هتد).

د-کانزا:-بەشێك لەپیشەسازییە دەستییەکانی هەورامان کەئامرازەکانی بەرهەم هێنانو راو وشکارو جەنگ بوون، کەرەستە خاوەکەیان بەشێکی ناوخۆیی بووە وەك(شاخی ئاژەڵ بۆ دەسکی چەقۆو خەنجەر بەکاردەهێنرا، بەشێکیشی دەرەکی بووە کە لەرێی بازرگانیو ئاڵوگۆڕەوە هاتۆتە ناوچەکەو پیشەسازی پێوەکراوە). وەك(ئاسن، مس، زیو، زێڕ) کەوەستاکان بەپێی پێویستییەکان ئامێرو ئامرازی جۆراوجۆریان لێ دروست کردوە، لە(زێڕوزیو)خشڵو کەلوپەلی رازاندنەوەی ئافرەت دروست کراوە، لە(ئاسن)ئامێرە کشتوکاڵییەکانو جەنگییەکانو راو وشکار دروست کراوە، لە(مس) ئامێرەکانی ناوماڵ وەك مەنجەڵو سینیو کەوچكو دەفرو شتی تر کەپێویست بون دروست کراوە.

بەگشتی پیشەسازی لەهەوراماندا دوو بەشە:-

بەشی یەکەم:-پیشەسازییە بەرهەم هێنەرەکان.

ئەو پیشەسازییانەن کە بەکاردەهێنرێن بۆ بەرهەم هێنان لەجمو جۆڵو چالاکییەکانی(کشتوکاڵ کردن، پیشەسازی کردن، بازرگانی کردن، کانزاکاری)تردا. هەروەها کەرەستەی تری وەك مەنجەڵو سینیو کەوچكو دەفر بەرهەم دێنێ.

بەشی دووەم- پیشەسازی‌یە بەکاربەرەکان، کەئەوانەش (خۆراکی‌یەکان‌و رِستن‌و چنین‌و کانزایی‌یەکان)ن مەبەست لە خۆراکییەکان هەموو ئەو پیشەسازیانە دەگرنەوە کەدەبنە خۆراک‌و بەکاردەبرێن رۆژانە وەك پیشەسازی (دۆشاو دروست کردن- دۆشاوی تەماتەو دۆشاوی توو و رِوبەهەنار، نان دروست کردن لەهارِینی گەنمەکە وە تادەگاتە دروستکردنی نان کە بە(نانی هەورامی) بەناوبانگە، هەموو پیشەسازی‌یە خۆراکی‌یەکانی وەك شیرەمەنی‌یەکان، هەویری‌یەکان، خۆشاو، شیرینی‌یەکان).

رستن‌و چنین مەبەست لەپیشەسازی‌یەکانی رستن‌و چنین لەهەورامانداا ئەو کالاّو کەرەستانە دەگرنەوە کە بەچنین‌و رستن بەرهەم دەهێنرێن‌و هەردوو رەگەزی(نێرو مێ)بەشداری دەکەن لەبەرهەم هێنانیدا. هەورامان بەرِستن‌و چنین بەناو بانگ بووە لەسەردەمە کۆنەکاندا، ئێستاش ئەو پیشەیە ماوە، بەلاّم بەرەو لاوازی‌و پوکانەوە دەچێت، چونکە کالاّو کەلوپەلە نوێکانی بیانی جێیان پێ لێژکردون کەبەنرخێکی هەرزان‌و لەماوەیەکی کورتدا دەستەبەر دەکرێن. ئەو کەسانەی کەبەو پیشەیەوە خەریك بوون بە(جۆلاّ، کلاّشکەر، پێلاّودروو، خەیات، هتد..)ناسراون.

کانزایی‌یەکان ئەو کالاّو کەلوپەلانەی کە لەکانزاکانی ئاسن‌و مس‌و قورِقوشم‌و شاخی حەیوان درِوست کراون لەهەوراماندا لەلایەن چەن وەستایەکەوە بووە کە بە(ئاسنگەر، خەمخاساز، چەقۆکەر،...هتد) ناسراون. هەندێکی تری لەکالاّو کەلوپەلەکان کە لەدارو بەرد دروست کراون لەلایەن چەند وەستایەکەوە کە بە(دارتاش‌و بەردتاش) ناسراون. هەندێکی‌تر لەکالاّو کەلوپەلەکان بۆ رازاندنەوەو

جوانکاری بەکارهێنراون لەلایەن چەند وەستایەکەوە کە بە(خومچیو ڕەنگکەرەکان)ەوە ناسراون.

ئەم دوو جۆرە پیشەسازییە کە لەهەورامان دەکرێن لەناو(ماڵەکاندا یا لەدوکانەکاندا) بەرهەم دەهێنرێن بەسەرمایەیەکی کەمو ژمارەیەکی کەمی وەستاو کرێکار کە لەچوارچێوەی خێزانو بنەماڵەدا تێپەڕناکەن، وەدەچنە بەشی پیشەسازییە(سوکەکان- سەرەتاییەکان- دەستییەکان)ەوە، چونکە پێویستیان بەکارگەی گەورەو سەرمایەی زۆرو ڕێکخستن نییە. هەندێکی لەهەوراماندا بەکاردەبرێنو بەشێکیشی بازرگانیان پێوەکردووە.

کاریگەریی پیشەسازیی خۆماڵی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای هەورامان:

پیشەسازی وەك لایەنێکی پێکهاتەی سستمی ئابووری کۆمەڵگای هەورامان چەند یەکەیەك بەشداری تیادەکات، وەك(خێزان، بنەماڵە)، بەرهەمەکەیان بۆ هەموو کۆمەڵگاکە دەبێتو لەڕێی بەرهەمەکەیانەوە پردی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دروست دەبێت، یەکترناسینو هاوکاری کردنی یەکترو خۆشەویستی نێوانیان بەهێز دەبێت، کەهەموویان هەست بەوە دەکەن کەیەك خێزان بن بەو جۆرە بەیەکگرتوویی پەرە بەژیانی کۆمەڵایەتی دەدەنو پشتی یەکتری دەگرنو بەهانای یەکترەوە دەچن لەکاتی پێویستدا، هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی یەکتردەکەنو کۆمەڵگاکە بەیەکەوە دەبەستنو جیاوازییەکان کەم دەبنەوەو رقو دووبەرەکایەتی نامێنێتو بەئاشتیو ئاسایش ژیان

بەسەر دەبەن. ئەو رەوشەش دەبێتە مایەی یەکگرتوویی کۆمەڵگاکەو بەستنەوەی ئەندامەکانی بەیەکترەوەو رۆڵو پێگەی ئەندامەکان کار لەیەکتر دەکەنو دەبنە تەواوکەری یەکترو پێویستیەکانی کۆمەڵگاکە پڕدەکەنەوە. بۆ نمونە چاوپێکەوتنمان لەگەڵ وەستا(قادری جۆلا)دا کردو ئەم پرسیارانەمان ئاراستە کرد. پرسیار: ئەم پیشەیە لەباوو باپیرتەوە بۆت ماوەتەوە یان خۆت فێری بوویت؟ وەڵام: خۆم فێری بوم، پرسیار: چەند ساڵە ئەم پیشەیەت؟ وەڵام: نزیکەی ٤٠ ساڵ دەبێت. پرسیار: پیشەکەت بژێویو گوزەرانت دابین دەکات؟ وەڵام: نەخێر من موچەشم هەیەو خانەنشینیشمو ئەم کارەش ئەکەم. پرسیار: بەرهەمەکەت لای خەڵکی ناوچەکە پەسەند دەکرێت؟ وەڵام: بەڵێ زۆر پێیان باشە، بەڵام ئەم پیشەیە ئێستا وەك جاران خواستی خەڵکی لەسەر نییەو بەرەو پوکانەوە دەچێت، چونکە کەرەستە سەرەتاییەکانی ئەم بەرهەمەی ئێمە کەمنو بەئاسانی دەست ناکەونو زۆریان تێ دەچێتو ماوەیەکی زۆری دەوێت بۆ دروستکردنیانو گران بەهانو خەڵکەکەش هەژارە چەند کەسێکی دیاریکراو نەبێت خەڵکی تر ڕوومان تێ ناکەن. پرسیار: ئەم پیشەیەی تۆ هیچ کاریگەری هەیە لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانت؟ وەڵام: بەڵێ، بەهۆی پیشەکەمەوە بەشی هەرە زۆری خەڵکی هەورامان دەناسم، هەچ پێویستیەكو روداوێك کەرو بدات دەبێت بچم بەدەمیەوەو سەردانی ئەو کەسانە بکەمو ئەوەش بۆتە هۆی بەهێزبونی پەیوەندییەکانم لەگەڵ خەڵکی هەوراماندا، ئەوانیش زوو زوو

سەردانی من دەکەنو هاتوچۆی یەکتریو تێکەڵاوی یەکتر دەکەینو وەك ئەندامانی خێزانێکمان لێ هاتووە.

هەروەها چاوپێکەوتنمان لەگەڵ وەستا (جەبار)دا کرد کەوەستای کڵاش کردنە لەهەوراماندا و چەند پرسیارێکمان ئاراستەکرد. لەوەڵامی تێکڕای پرسیارەکانماندا بەم جۆرە وەڵامی داینەوە:- پیشەکەی ئێمە قورسو گرانەو سەلیقەو وردەکاری دەوێتو کەرەستە خاوەکانی بەگران دەستەبەر دەکرێن، بۆیە نرخی کڵاش گرانە. بەڵام بەهۆی پیشەکەمانەوە خەڵکێکی زۆر روومان تێ دەکاتو زۆرینەی خەڵکی هەورامان دەناسمو لەکاتی رودانی روداوە کتوپڕو دڵتەزێنەکاندا سەردانم دەکەنو بەسەرم دەکەنەوە، منیش هەروەها سەردانیان دەکەمەوە چونکە ئێمە بەهۆی ناسراوی پیشەکەمانەوە لەگەڵ خەڵکی هەوراماندا وەك ئەندامانی یەك خێزانمان لێ هاتووەو ئاگاداری هەموو جموجۆڵو روداوەکانی ناوچەکەین کەروو دەدەن ئەو پیشەیەی من بۆتە هۆی یەکترناسینی منو کۆمەڵگای هەورامانو پەیوەندیەکانمان پتەوو بەهێزبوونو لەهەموو رویەکی کۆمەڵایەتی‌یەوە کاریگەرییان هەیە، ئەمە جگەلەوەی دوکانەکەی منو پیشەکەی من بوەتە شوێنی یەکترناسینی هەورامییەکان چ ئەوانەی لەناو هەورامان دەژین یا ئەو هەورامیانەی لەدەرەوەی هەورامانو بۆ کڵاش کڕین سەردانمان دەکەن، مەبەستم لەدەرەوەی هەورامان ئەو هەورامیانەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی عیراق دەگرێتەوە، جاروباریش هەورامییەکانی کوردستانی ئێرانیش سەردانمان دەکەنو پەیوەندی کڕینو فرۆشتنمان هەیە لەگەڵیاندا.

**٣-بازرگانی**

بازرگانی بەشێکی سستمی ئابووریەو ڕواڵەتێکە لەڕواڵەتەکانی ژیانی ئابوری، لەسەر بنەمای وەرگرتن‌و پێدان دامەزراوە[٤٤]. هەروەها ڕەنگ دانەوەی ئاستی گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت[٤٥]. بەواتا بازرگانی سیمای کردنەوەو پەیوەندی کردن‌و دەرچونە لەبازنەیەکی داخراودا بەڕوی دنیای دەرەوەدا[٤٦]. هەروەها بازرگانی ئەوە دەگەیەنێت هاوسەنگ بوونی نرخی شمەك بەتێچونی گواستنەوەشەوە لەئاڵوگۆڕکردندا، ئەوەش دووجۆرە بازرگانی دەرەوەو بازرگانی ناوەوە[٤٧]. بەو پێیە بازرگانی ئاڵوگۆڕی شمەك‌و کارە خزمەت گوزاریەکانە لەنێو وڵاتان‌و گەلاندا لەکۆن‌و نوێدا رویداوە[٤٨]. بازرگانی کردەیەکی ئابوریەو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌یە لەبەر پێویستی پەیدا دەبێت‌و دوو جۆرە بازرگانی ناوەوەو دەرەوە، شمەکی زیادە بەرهەمهاتوی زیاد لەپێویست ئاڵوگۆڕ دەکرێت بەشمەکی‌تر کەپێویستن، پێویستە لەو کردەیەدا هاوسەنگ بونێك هەبێت بۆئەو ئاڵوگۆڕە. بازرگانیش کەیەکێکە لەچالاکییەکانی مرۆڤایەتی ئەویش بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی کردوە تا ئەو کاتەی کەپارە پەیدابووەو ئیتر ئاڵوگۆڕ

---

[٤٤] د.قيس النوري، الأنثروبولوجيا الأقتصادية، المصدر السابق، ص١٣١.

[٤٥] نخبة من الباحثين العراقيين، حضارة العراق، ج١٢، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥، ص١٥٢.

[٤٦] د.قيس النوري، الأنثروبولوجيا النفسية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، دار الحكمة للطباعة والنشر، ١٩٩٠، ص٣٥٢.

[٤٧] بومول و جاندلر، علم الاقتصاد العمليات و السياسات الاقتصادية، ترجمة سعيد السامرائي و وآخرون، ج٢، مطبعة أسعد، ١٩٦٥، ص١٤٥.

[٤٨] عبدالمنعم السيد علي، مدخل في علم الاقتصاد مبادئ الاقتصاد الكلي، ج٢، المكتبة الوطنية-بغداد، ١٩٨٤، ص٢٠٨.

بەپارەکراوە، وەپارە بەهاو نرخی شمەکی یاکەلوپەلی دیاری کردووە بەدوای پەیدابوونی پارەدا بازرگانی چوە قۆناغێکی نوێوە وجێگیر بوو[٤٩]

کۆمەڵگای هەورامان وەك کۆمەڵگایەکی کۆن خاوەن بەرهەمو بەرووبووم بووە لەچەند بوارێکدا زیاد لەپێویست شمەکی بەرهەم هێناوە، لەهەمان کاتیشدا کۆمەڵگایەکی داخراو بووە پێویستی بەکەرەستەی جۆراو جۆر بوە کە لەتوانایدا نەبوە بەرهەمی بهێنێت، بۆ بەدەست هێنانی ئەو کەلوپەلە پێویستانە پەنای بردوەتە بەر(ئاڵوگۆڕکردن)لەگەڵ دەورووبەریدا، ئەو ئاڵوگۆڕکردنە لەسەرەتاوە(شمەك بەشمەك)بوە دواتر کەپارە پەیدا بووە ئەو ئاڵوگۆڕەش گۆڕاوە شمەك بەپارە لەرێی ئەو چالاکی‌یەوە توانیویەتی کەلەوپەلو بەروبومی زیادە بەرهەم هاتوو بگۆڕێتەوە بەو کەلوپەلانەی کەپێویستی بووە، ئەویش لەرێی(کاروان کردن)ەوە بوە، واتا بەئاژەڵی باری(ئێسترو گوێدرێژ)کاروان کراوە. لەبەرنەبونی رێگاکانی هاتوچۆی ئوتومبێلو شەمەندەفەر هەورامییەکان لەگەڵ ناوچە سنوری‌یەکان بەو جۆرە ئاڵوگۆڕیان کردوە ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕکردنە بە(بازرگانی دەرەوە)دادەنرێت. کەکۆمەڵگای هەورامان بۆماوەیەکی دوورودرێژ پەیڕەوی کردوە تا ئەو کاتەی رێگای ئوتومبیل لەعیراقدا کراوەتەوەو هەورامان بەرێگای ئوتومبێلەوە بەستراوەتەوە.

جگە لەم جۆرە بازرگانییە لەناو کۆمەڵگای هەورامان خۆیدا جیاوازی هەیە لەنێوان دێیەك بۆ دێیەکی‌ترو شارۆچکەیەك بۆ شارۆچکەیەکی تر لەڕوی بەرهەم هێنانو بەروبومەکانەوە، بۆ

---

[٤٩] جان بابی، القوانین الاساسیة للاقتصاد الراسمالی، المصدر السابق، ص٢٢، ٨٥.

پڕکردنەوەی پێویستی‌یەکان لەناوخۆشدا (بازاڕو دوکان) کراونەتەوە بۆ ئاڵوگۆڕکردن‌و کڕین‌و فرۆشتنی کەلوپەل‌و شمەکە پێویستەکان، وە هەندێك دێ‌و لادێ دوورە دەست بوو لەڕێی (ووردەواڵە فرۆشی) یەوە پێویستی‌یەکانیان پڕکراوەتەو کەهەندێك (بازرگانی گەڕۆك) بەسەر دێ‌و لادێ‌کاندا گەڕاون‌و شمەك‌و کەلوپەلیان پێ فرۆشتون‌و بەروبومە زیادەکانیان لێ کڕیون، ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕکردنەش بە (بازرگانی ناوەوە) دەژمێردرێت، کە لەهەوراماندا پەیڕەو کراوەو تائێستاش بەدی دەکرێت.

بۆ یەکەم جار کەئوتومبیل هاتە عیراق ساڵی ١٩٠٨ بووە[٥٠] و لەساڵی ١٩٥٦دا هەورامانی کوردستانی عیراق ڕێگای ئوتومبیلی بۆ کراوەتەوە[٥١] بەگشتی لەسەرەتاوە بازرگانی لەهەوراماندا لاوازبووە، چونکە (تۆپۆگرافیای ناوچەکەو زۆری دانیشتوان‌و کەمی شمەکی بەرهەم هاتوو و کەمی بەروبومەکانی‌و نالەباری ڕێگای هاتوچۆی‌و بارە رامیاری‌یە ناجێگیرەکەی‌و کەمی پارە)، هەموویان فاکتەری لاوازبوونی بازرگانی بوون لەهەوراماندا.

بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە هەلومەرجەکان گۆڕان‌و بارو دۆخێکی نوێ هاتۆتە ئاراوە کەیارمەتی دەربووە بۆ چالاکبونی دیاردەی بازرگانی لەهەوراماندا کەئەویش (ڕاکێشانی ڕێگای هاتوچۆی ئوتومبیل‌و زۆربونی پارەو زۆری خواست لەسەر کەلوپەل‌و شمەکی نوێ‌و بڵاوبونەوەی ڕۆشنبیری‌و گەشەکردنی هوشیاری خەڵکی

---

[٥٠] د. علي الوردي، لمحات اجتماعية في تاريخ العراق الحديث، ج١، مطبعة الارشاد - بغداد، ١٩٦٩، ص٢٨٧.

[٥١] ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان، مەڵبەندی ڕۆشنبیریی هەورامان، ٢٠٠٤، ل٢٦٥.

هەورامانو گۆڕینی باری رامیاریی ناوچەکە)بوو. کەئەمانە فاکتەری چالاك بوونی هەردوو جۆرە بازرگانییەکە بوون. کۆمەڵێك کەرەستەی زیادە بەرهەم هاتوور وەك(تەختە، سپی چنار، گوێز، تووی ووشك، هەڵوژەو قەیسیی ووشك ..هتد)دەگوێزرانەوە بۆ بازاڕەکانی کوردستانو عیراق، لەبەرامبەر ئەوانەشدا کەلوپەلە پێویستەکان وەك(گەنمو جۆو رۆنو نەوتو شەکرو چا.هتد) دەهێنران، بەپارە کڕینو فرۆشتن ئەنجام دراوەو پێویستیی‌یەکان پڕکراونەتەوە.

ئەگەر بێتو سەرنجێك بدرێت لەژیانی ئابووریی هەورامان دەبینین فاکتەری جوگرافیو رێگای هاتوچۆو پەیدابونی دراوو باری رامیاری کاریگەریان هەبوە لەسەر لاوازبوون یا چالاکبونی ژیانی ئابووریی هەورامان، ئەوەش کاری کردۆتە سەر پەیوەندیی‌یە کۆمەڵایەتیی‌یەکانو لایەنەکانی تری پێکهاتەی کۆمەڵگای هەورامان. بۆ نموونە چاوپێکەوتنمان لەگەڵ دوو بازرگانی هەورامان کرد بەناوی(کاك باقیو حاجی کەریم)کۆمەڵێ پرسیارمان ئاراستەکردن ئەوانیش بەم جۆرە وەڵامیان دایەوە. پرسیار: ئایا ئێوە دوو بازرگانی دێرینی هەورامانن؟ وەڵام: بەڵێ، پرسیار: چەند ساڵ بازرگانیتان کردوە؟ وەڵام: نزیکەی ۳۰-۳۵ ساڵ. پرسیار: ئەو کەلوپەلانەی بازرگانیتان پێوە دەکردن چی بون؟ وەڵام زۆر شت بوو، ئەوی گرنگ بێت(گوێز، توو، هەڵوژە، قەیسی، توتن،...هتد) هەروەها داروتەختەو سپی چناریش. پرسیار: لەگەڵ کوێ بازرگانیتان دەکرد؟ وەڵام لەگەڵ سلێمانیو بەغداو موسڵ. پرسیار: ئەی چیتان دەکڕی؟ وەڵام: ئەوەی پێویست بوبێت کڕیومانەو گواستومانەتەوە بۆ هەورامان بەتایبەتی(شەکرو چاو رۆنو برنج). پرسیار ئێستا بازرگانی چۆن دەبینن لەهەوراماندا؟

وەڵام: ئێستا بازرگانی زۆر ئاسانەو مەترسی نی‌یەو خێروبێری زۆرترە، ئەوسا کەئێمە بازرگان بوین رێگای هاتوچۆ مەترسی‌ی زۆری لەسەر بوو کری‌ی گواستنەوە زۆر گران بوو ئوتومبیل دەست نەدەکەوت رێگای ئوتومبیل بۆ هەموو دێکانی هەورامان نەبوو، هەروەها باری رامیاری زۆر خراپ بوو، پارە کەم بوو، پیاو خراپ‌و رێگری لەسەرجادەکان زۆر بوو بەتایبەتی لە(چۆڵی قۆلفە)دا ئیتر ئەوە ئازاردان لەبازگەکانی عیراقدا با لەولاوە بوەستێ، جگە لەبەرتیل‌و زۆرجار دەگیراین‌و سەرانەیان لێ دەسەندین. ئێستا زۆر باشە ئەوانە نی‌یەو نەماون بەئاسانی‌و بێ ترس‌و لەماوەیەکی کەمدا چیت دەوێ‌و چ کەلوپەلێکت پێویستە دەیگەیەنێتە هەورامان‌و لەوێوە چی زیاد بێت دەیبەیت بۆ شارەکانی تری کوردستان‌و عیراق. پرسیار: ئەو پیشەیەی ئێوە کاریگەریی هەبوو لەسەر پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتییەکانتان؟ وەڵام: بەڵێ، ئێمە بەهۆی پیشەکەمانەوە زۆرینەی خەڵکی هەوراماغان دەناسی‌و هاتوچۆمان دەکردن‌و سەردانمان دەکردن ئەوانیش هەروەها، لەخۆشی‌و ناخۆشی یەکتریدا بەشداریمان دەکردو وەك ئەندامانی خێزانێکمان لێ هاتبوو، بەڵام ئێستا دنیا گۆڕاوە پەیوەندییەکانیشمان وەك ئەوسا نەماون، خۆشەویستی‌و یارمەتیدان‌و هاوکاری کردنی یەکتری کەم بۆتەوەو ئێمەش لەهەورامان دوور کەوتوینەتەوەو پەیوەندییەکانمان خەریکە لاواز دەبن.

### ٤-کانزاکردن

کانزاکردن کۆڵەکەیەکی گرنگ‌و رواڵەتێکی ژیانی ئابوری‌یە، ئەو گەل‌و وڵاتانەی کەتوانای کانزاکردنیان هەیە دەتوانن ببنە خاوەن بازاڕ، کەواتە ژیانی ئابوری بەشێکی هەرەزۆری بەکانزاکردنەوە بەستراوە

بەتایبەتی ئەو وولاتانەی کەپێشکەوتون لەبواری کانزاکردندا توانیویانە بازاڕی زۆر لەوولاتانی تر بۆ خۆیان قۆرخ بکەن. کانزاکردن پێویستی بە(کەرەستەی خاوو سەرمایەی زۆرو کرێکاری شارەزاو پسپۆڕو کارگەی گەورەو رێکخستنێکی ووردو پێشکەوتوو)هەیە کەواتە کانزاکردن زۆرتر وولاتە پێشکەوتووە پیشەسازی‌یەکان دەگرێتەوە کە لەبواری تەکنەلۆجیدا بالادەستن.

کۆمەڵگای هەورامان لەڕوی کانزاکردنەوە خاوەنی ئەو بنەمایانەی سەرەوە نی‌یە کەپێویستن بۆ کانزاکردن کەواتە کۆمەڵگایەکە لەڕوی کانزاکردنەوە لاوازو بێ توانایە، بۆ بەدەست خستنی هەندێك کەرەستەی کانزایی کەپێویستن بۆ چالاکی‌یە(کشتوکاڵی‌یەکان، پیشە دەستی‌یەکان)لەڕێی بازرگانی‌و ئاڵوگۆڕەوە دەستی دەکەون‌و پیشەسازیان پێوەدەکات‌و لەبواری بەرهەمهێناندا بەکاریان دەهێنێت ئەگەر پشکنین‌و سۆراخ کردنێك بکرێت لەهەوراماندا دووری‌یە کەرەستەی خاوی کانزاکردن دەست بکەون چونکە لەشارۆچکەی خورماڵ (گەڕاو) هەیە کە بەسروشتی دێتە دەرەوە. ئەو کەمتەرخەمیەش بەپلەی یەکەم بەرۆکی کۆمەڵگاکە دەگرێتەوە کەمتەرخەمی دەسەڵاتداران‌و فەرمانڕەوایان‌و دەوڵەت نیشان دەدات بەرامبەر بەناوچەکە، دووریش نی‌یە بیرو بۆچوون‌و داب‌و نەریت‌و یاساو رێساکانی کۆمەڵایەتی رێگر نەبوبن. هەروەك زانایەك دەڵێت((دواکەوتنی کۆمەڵگا خۆجێ‌ییەکان لەئەنجامی رەنگدانەوەی تایبەتمەندیەکانی سستمە ئابوری‌یەکەی‌و رامیاری‌یەکەی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکەی‌و شارستانێتەکەیدا بووە))[٥٢].

---

[٥٢] بول سويزي، الامبريالية، ترجمة عصام الخفاجي، دار ابن خلدون، ١٩٨٠، ص١٠٣.

### ٥-گەشتو گوزار( هاوینەهەوار)

هەر گەڕیدەو بیانییەك‌و تەنانەت خەڵكی لای خۆشمان كەڕێیان كەوتبێتە هەورامان، جوگرافیای ناوچەكەو سەلیقەو كارامەیی خەڵكەكەی‌و رەزو باخ‌و پیشە دەستییەكان‌و ئاوو هەوای هەورامان سەرنجی راكێشاوە. بەپێی توانای خۆیان وبەپێی بەرژەوەندییەكانیان باسێكیان دارشتووەو چامەیەكیان هۆنیوەتەوە هەر لە(گۆرانی شاعیرو قانع و شاكر فەتاحەوە بیگرە هەتا دەگاتە ریچ‌و سۆن‌و ئەدمۆندزو نیكتن‌و ڤان برۆنەسەن)ئەو سروشتە دڵگیرە تائێستا نەبۆتە سەرچاوەی داهات وبەشداری نەكردووە لەپێكهاتەی ژیانی ئابووریی هەوراماندا، چونكە بارە رامیاری‌یەكەیی‌و كەمتەرخەمی دەسەڵاتداران‌و ئاوڕنەدانەوەی دامودەزگا بەرپرسەكان‌و بانگەشە نەكردنی هۆكانی راگەیاندن كەهانی گەشتیاران‌و سەیرانكەران بدەن روو بكەنە ناوچەكە، هەموویان فاكتەری نالەبار بوون لەو بارەوە، ئەوەش كاریگەری خراپی كردۆتە سەر پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی ناوچەكە لەگەڵ دنیای دەرەوەداو لاوازكردنی ئەو لایەنەی ژیانی ئابووریی هەورامان*

---

*كلاید كلۆكهۆن دەڵێ((لەبەر ئەوەی زانیاریی تۆماركراو نییە لەسەر خێڵێك كەلێكۆڵیار باسی دەكات، یا زانیارییەكان كەمن‌و بەشی پێویستی ناكەن‌و راست نین‌و یەكتر تەواو ناكەن، چاك وایە پشت ببەستێت بەوەرگرتنی نموونە یابیستن لەخەڵكەكە كەباسیان دەكات، نەك بەشتی تۆماركراوی ناو پەرتوكەكان).
الانسان في المرآة، علاقة الانثروبولوجي بالحياة المعاصرة، ترجمة الدكتور شاكر مصطفى سليم، مطبعة أسعد، بغداد ١٩٦٤، ص١٣.

**٦-كارگێڕی**

هەرچەندە کارگێڕی بەشێکە لەپێکهاتەی سستمی کۆمەڵایەتی، بەڵام لەبەرئەوەی بۆتە سەرچاوەیەکی دەرامەتو گوزەران بۆیە ئێمە وەك پێکهاتەیەکی ژیانی ئابووری ئاماژەمان پێ کردووە.

لەکۆمەڵگای هەوراماندا خوێندنو خوێندەواری بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ زانستە ئایینییەکان بوون کە(بیارەو تەوێڵە)وەك دوو مەڵبەندی رۆشنبیری ئایینی نەك هەر لەناوچەکە بەڵکو لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێگەیەکی دیاریان هەبووە[٥٣]((نە هەرئەوە بەڵکو زۆری نەخایاند کەپەلی بۆ هەموو کونجێکی جیهانی ئیسلامی هاوێشتو خانەقاکانی لێ دامەزران))[٥٤].

کاتێك کەرۆشنبیریی نوێو خوێندنو خوێندەواری نوێ سەری هەڵدا لەسییەکانی سەدەی بیستەوە قوتابخانەو خوێندنگای نوێ لەهەورامان کرانەوەو کۆمەڵگای هەورامان بەگەرمییەوە پێشوازی کردووە بەپەرۆشەوە منداڵەکانیان خستونەتە بەر خوێندن بەهەردوو رەگەزەکەوە(نێر، مێ)لەسەرەتاوە ماڵەکانی خۆیان کردوە بەقوتابخانە تا ئەو کاتەی کەدەوڵەت بینای خوێندنگای دروست کردووە لەسەرەتاوە لە(بیارەو تەوێڵە)وە دەستی پێکردووە دواتر لەدێ ولادێکانی تری هەوراماندا قوتابخانە کراوەتەوە.

---

[٥٣] مارتین فان برۆنەسن، ئاغاو شێخو دەوڵەت، وەرگێڕانی کوردۆ، بەرگی دووەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٣، ل١٤٣-١٤٤، ١٨٩.

[٥٤] د. رەشاد میران، رەوشی ئایینیو نەتەوەیی لەکوردستاندا، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٦١.

یەکەم دەستە نۆبەرەی ئەو پرۆسە نوێیە لەکۆتایی ساڵەکانی سی سەدەی بیستەمدا هاتۆتە بەرهەم، دوای ئەو ماوەیە دەستە بەدەستە خوێندکار دەرچوونو لەفەرمانگە میریەکاندا دامەزراون، لەماوەیەکی کەمدا خوێندەواری دەرچووی کۆمەڵگای هەورامان ئەوەندە زۆربون کەنەك هەر پێویستییەکانی هەورامانیان دابین دەکرد، بەڵکو بەشێکیان لەشارو شارۆچکەکانی تری کوردستانو عیراق دادەمەزرانو دەبونە فەرمانبەرو موچەیان وەردەگرت، موچەکانیان دەبوە داهات بۆ ژیانی ئابووریی کۆمەڵگای هەورامان.

ئێستا لەکۆمەڵگای هەوراماندا هەموو فەرمانگە میریەکان فەرمانبەرەکانیان خەڵکی ناوچەکەن ئەوەش لەدوو لاوە سوودبەخشە، لەلایەکەوە دڵسۆزن لەکارگێڕیو فەرمانبەریو کارگوزاریدا، لەلایەکی ترەوە ئەو(کات)ەی کەبۆیان دەمێنێتەوە بەفیڕۆی نادەنو لەچەند پیشەیەکی تردا سوودی لێوەردەگرن.

چالاکییەکانی ئابووری کە لە(کشتوکاڵو پیشەسازیو بازرگانیو کانزاکردنو گەشتوگوزارو کارگێڕی)پێك هاتبوون هەموویان بەشداری دەکەن لەپێکهاتەی ژیانی ئابووریی کۆمەڵگای هەوراماندا.

## کاریگەریی ژیانی ئابوری لەسەر پێکهاتەی ژیانی کۆمەڵایەتیی هەورامان

ئەو دیاردەیە لەهەوراماندا پەیوەندیەکی تەواوی هەیە بەژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای هەورامانەوە چ لەڕووی پەیوەندی تاکەکان بەیەکترەوە چ لەڕوی پەیوەندی تاکەکان بەکۆمەڵگاوە چ لەڕوی پەیوەندی کۆمەڵگاکە بەدەوڵەتەوە چ لەڕوی پەیوەندی کۆمەڵگاکە بەجوگرافیای ناوچەکەوە، کەیەك کار لەوی تر دەکاتو دەبنە

تەواوکەری یەکترو بەیەکەوە بەستراون‌و تۆڕێکیان پێك هێناوە کەسستمی ژیانی کۆمەڵگاکەی ڕێك خستووە بەهاوکاری ژیانی رامیاری و شارستانیەت‌و دابینکردنی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاکە. هەچ گۆڕانێك ڕوودات لەلایەنێك لەلایەنەکانی سستمی کۆمەڵگا کەتێکڕای سستمەکە گۆڕانی بەسەردا دێت‌و کۆمەڵگاکە دەگۆڕێت جا ئەو گۆڕانە بۆ پێشەوە بێت یا بۆ دواوە. بەڕای هەندێك لەئابووریناسان ئابووری یەکەم پێکهێنەرو بناغەی دامەزراندنی پێکهاتەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یە، لەو ڕوانگەیەوە ژیانی ئابووری هەوراما‌ن کۆڵەکەیەکی بەهێزی ڕاگرتنی ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاکەیە چونکە بەئاسانی دەستەبەر ناکرێت بەڵکو پێویستی بەڕەنج‌و ماندووبونێکی زۆرە، ئەوەش فاکتەرێکی گرنگە کەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهێز دەکات چونکە تێکەڵ بوون‌و یارمەتیدان‌و هاوکاریکردنی یەکتر وەك پرۆسەیەك‌و وەك داب‌و نەریتێك ماوەتەوەو کۆمەڵگاکەی بەیەکەوە بەستووە.

## هێلکاری(٥)

**پێکهاتەی ژیانی ئابوریی کۆمەڵگای هەورامان نیشان ئەدات.**

## باسی سێیەم

# ژیانی سیاسیی هەورامان

ژیانی رامیاری بەشێکە یا لایەنێکە لەلایەنەکانی پێکهاتەی ژیانی مرۆڤایەتی کە ململانێیە لەپێناو دەسەڵاتدا، وەپێناسە دەکرێت بەم جۆرە، بریتییە لەچالاکییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا بەجیا، یا چالاکییەکانی کۆمەڵە رێکخراوەکان، بەمەبەستی بەدەست هێنانی(دەسەڵات)ی دان پیانراوی کۆمەڵگا لەفەرمانڕەوایدا هەروەها ناکۆکییەکانو ململانێکانە لەسەر فەرمانڕەوایی.[1] لەلایەکی ترەوە پێناسەکراوە بەوەی بریتییە لەسستمی کاری رامیاری.[2] ژیانی رامیاری واتا بەشداری کردنە لەکاروباری دەوڵەتدا، ئەوەش بۆچونی دەوڵەتو دیاریکردنی شێوەکانیو ئەرکەکانیو ناوەرۆکی چالاکییەکانی دەوڵەت دەگرێتەوە.[3]

پێناسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەرامیاری ململانێیە بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی، جا ئەو ململانێیانە هەیانە بەرێککەوتن کۆتایی دێتو شێوەی پێشبڕکێ وەردەگرێت، هەشیانە دژایەتی کردنەو رێك ناکەون تا لایەك بەسەر لایەکی تردا

---

[1] د. صادق الاسود، علم الاجتماع السياسي، مطابع الجامعة، جامعة بغداد، ١٩٨١، ص٦٧.

[2] جورج بالانديه، الأنثروبولوجيا السياسية، ترجمة جورج أبي صالح، مركز الانماء القومي، بيروت-لبنان، ١٩٨٦، ص٢٣.

[3] أناتولي الكسندر فيتش فيدوسييف، السياسة كموضوع للدراسة الاجتماعية، ترجمة زياد الملا، دار دمشق للطباعة والنشر، ١٩٨١، ص١٩.

سەرنەکەوێت.[٤] گەیشتن بەدەسەڵات واتا بەدەست هێنانی فەرمانڕەوایی ئەوە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە واتا رازی بوون‌و مل کەچ کردن بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتی‌یە.[٥] مێژوو خەڵك دروستی دەکات، خەڵکیش پێك هاتووە لەتوێژو دەستەو چینی جیاواز، پێویستە لەهۆکانی پەیدابونی ئەو جیاوازیانە بکۆڵرێتەوە، کەبەرژەوەندی‌یەکان دروستیان کردون، ئەوانیش دەبنە هۆی پەیدابونی ململانێکان.[٦] ململانێکان لەنێوان دوو چیندا پەیدادەبن، کەچینێکیان(کەمینە)ن‌و خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان‌و دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایین، چینەکەی تر(زۆرینە)ن‌و رەنجکێشن‌و بێ دەسەڵاتن‌و بەشدار نین لەفەرمانڕەوایی‌دا.[٧] پەیدابونی جیاوازی چینایەتی بەپێی کات‌و شوێن‌و سەردەم‌و هۆکانی پەیدابونی جیاوازی چینایەتی دەگۆڕرێن.[٨] پەروەردەو فێرکردن، ئیش‌و کارو پیشە، بڕی پارە، زەوی‌وزار،ماڵیات، شێوەی گوزەران‌و بژێوی رۆژانە هەموویان هۆی پەیدابونی جیاوازی چینایەتین.[٩]

---

[٤] آرفنج زايتلن، النظرية المعاصرة في علم الأجتماع، ترجمة د. محمود عـودة و د. ابـراهيم عثمان، ذات السلاسل- كويت، ١٩٨٩، ١٨٠.

[٥] د. قيس النوري ود. عبدالمنعم الحسني، النظريات الأجتماعيـة، وزارة التعليـم العـالي والبحث العلمي، بدون سنة طبع، ص٢٧٠.

[٦] د. خضر زكريا، نظريات سوسيولوجية، مطبعة الأهالي، بدون سنة الطبع، ص١٠٥.

[٧] ستالين، أسس اللينينية، الشركة اللبنانية للكتاب، بيروت- لبنان، بـدون سـنة طبـع، ص٥٥، ٩٥.

[٨] بيار لاروك، الطبقات الأجتماعية، ترجمة جوزيف عبود كبة، ط١، منشورات عويدات، بيروت- لبنان، ١٩٧٣، ص٢٢.

[٩] نيقولا تيماشيف، النظريـات الأجتماعيـة، ترجمـة عـاطف غيـث، بدون اسم المطبعـة ومكان وسنة الطبع، ص٢٧٢.

ئەگەر بێینە سەر ژیانی رامیاریی گەلی کورد بەگشتیو ژیانی رامیاریی کۆمەڵگای هەورامان بەتایبەتی، بەپێی هەندێك سەرچاوەو بەپێی ئەو(دەمودوو) وەرگرتنانە کە بەپراکتیکی لەناو کۆمەڵگای هەورامانی لهۆنی بەشی کوردستانی عیراق وەرمان گرتووە، ژیانی رامیاریی کۆمەڵگای هەورامان لەسەردەمە مێژوویییەکاندا جیاوازە، بۆیە وەك خۆی ئەوەی لە(هەواڵدەر)ەکان وەرگیراوە بەم جۆرە دەخەینە روو، ژیانی رامیاریی ئەم کۆمەڵگایە دەکەین بەدوو بەشەوە(ئەنجومەن، دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی):-

### ١-ئەنجومەن

ئەو دەستە راوێژکارییە بە تەمەنانەن کە متمانەی رەوایی خەڵکیان بەدەست هێناوەو بەنوێنەرایەتی ئەوان فەرمانڕەوایەتی دەکەنو بەرزترین دەسەڵاتەو خاوەنی بڕیارە.

هەورامییەکان لەمێژووی رابردویاندا ئەنجومەنێکیان هەبووە بەناوی(ژیلێ مەرێ).*

### ژیلێ مەرێ

باسی ئەم زاراوەیە بەم جۆرەی خوارەوە کراوە ئەنجومەنێکی کۆنی کۆمەڵگای هەورامان بووە پێش ئیسلام پێکهاتەی ئەو ئەنجومەنە بەپێی گێڕانەوەکان دەقاودەق لەپێکهاتەی(پەرلەمان)ی ئەورووپا دەچێت. ئەو ئەنجومەنە لە٩٩ کەس پێکهاتووە، کەنوێنەری ناوچە

---

* ژیلێ: ناری ئەنجومەنەکەیە لەبەر کۆنیی زاراوەکە تۆزێك گۆڕانی بەسەردا هاتووە کەڕاستییەکەی ووشەی(ژیر)ە.

مەرێ: ناوی ئەو جێگایەیە کەئەنجومەن تیایا کۆبوەتەوە، دور نییە لەووشەی(مەڕ)ە=(ئەشکەوت) وەرگیرابێت کە بەسەر یەکەوە دەکاتە(ژێری مەڕێ-ژێرەکانی ئەشکەوت) لەبەر کۆنیی زاراوەکە گۆڕاوە بە(ژیلێ مەڕێ).

جیاوازەکانی سنوری دەسەلاتو فەرمانڕەوایی هەورامان بوون. (بەهمەنی) بەم جۆرەی نوسیوە((لەهەوراماندا ٩٩ کەسی دیینی هەبووە، لەجیاتی موغو پێشەوای دینی سەردەمی زەردەشت پێیان وتون: پیر، هەر کۆمەڵێ لەم پیرانە یەکێك رابەریان بووە، بەوە ووتراوە پیرشالیار. شالیاری پیرەکان= وەزیری پیرەکان)).[١٠]

دوو ساڵ جارێك ئەو ئەنجومەنە نوێ کراوەتەوە بەواتا هەڵوەشێنراوەو دروست کراوەتەوە، ئەندامەکانی بەشێوەی هەڵبژاردن لەناو جەماوەردا دیاریکراون، دواتر لەبارەگای ئەنجومەندا تاقیکراونەتەوە،* کۆبونەوەکانی ئەنجومەن بەپێی پێویست بووە، ئەو ئەنجومەنە خاوەنی

---

[١٠] پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٧

* تاقیکردنەوەی ئەنجومەن: دوای ئەوەی نوێنەری ناوچەکان هەڵبژێرراوە، رەوانەی بارەگای ئەنجومەن کراوە بۆ تاقیکردنەوە. لەبارەگای ئەنجومەندا(سەنگێك-پێوانەیەك) دانراوە نوێنەر دەبوایە ئەو سەنگە هەڵبگرێتو لەدەستی نەکەوێت، هەڵگرتنی ئەو سەنگەش پێویستی بە(هێزو بەژیری) بووە، ئەو نوێنەرە ئەگەر ئەو سەنگەی هەڵگرتبێت لەتاقیکردنەوە دەرچووە ئەگەر لەدەستی کەوتبێت لەتاقیکردنەوە دەرنەچووە، زۆرجار لەناوچەکان چەند نوێنەرێك رەوانەی بارەگای ئەنجومەن کراون بۆ تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی هەر نەبێت یەکێك لەنوێنەرەکان دەربچێت، ئەگەر هاتوو هەموو نێرراوەکان کەسیان لەو تاقیکردنەوە دەرنەچوبن ئەوە ناوچەکە بێ نوێنەر ماوەتەوە لەو خولەی هەڵبژاردندا، تا خولی داهاتوو(ئەنجومەن خۆی) سەرپەرشتی کاروبارەکانی ناوچەکەی کردووە. دەڵێن کاتی خۆی کەئەسکەندەری مەکەدۆنی یۆنانی پەلاماری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی داوە تا ئێرانی گرتووە لەناوچەی هەوراماندا سودی لەو(ئەنجومەنو فەرمانڕەوایەتیە ناوچەنشینی)یە وەرگرتوە، کە لەنوسینەکانی(هیرۆدۆت)دا ناوچەنشین بە(ستراب) نوسراوە وەئەنجومەن بە(پەرلەمان) نوسراوە. هەروەها لەپێش ئەسکەندەردا هیرۆدۆتس لەمێژووەکەی خۆیدا باسی ئیمپراتۆریەتی مادی کردوە کەئەو ئیمپراتۆرەتە دابەش بوە بەسەر ٢١ ستراب نشیندا واتا ناوچەنشیندا.

(بۆ زانیاری زیاتر سەیری پەرتوکی ئی. م. دیاکۆنۆف، میدیا، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧٣-٤٧٩) بکە.

بەرزترین دەسەڵات بووە، کەدەسەڵاتی دیاریکردنو لەکارخستنی فەرمانڕەوای ناوچەکانی هەبووە، بەپێی بیروباوەڕی ئەو سەردەمە سوێندی دڵسۆزیان خواردوەو پەیوەست بوون بەسوێندەکەیانەوە، بەپێی یاساو ڕێساو ئایینو دابو نەریتی ئەو سەردەمە هەڵسوکەوتیان کردوە.

ئەو ئاماژانە کەگەواهی بونی ئەو ئەنجومەنە ئەدەن ئێستا لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا ئەمانەن(زاراوەکە تا ئێستا لەناو کۆمەڵگاکەدا بونی هەیە، هەر کەسێك راستگۆییێتو ژیرانە بیربکاتەوە پێی دەڵێن(ژیلیٚ مەریٚ)یە ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە خەڵکی هەورامان زۆرتر مل کەچی بڕیارە بەکۆمەڵەکانن). وە ئەو ئەنجومەنە ئەوەندە لەکۆمەڵگاکەدا پیرۆزە تا ئێستاش خەڵکەکەی ئەگەر تووشی گیروگرفتێك یان تەنگو چەڵەمەیەك بن هاوار لە(٩٩ پیرەی هەورامان) دەکەن، کەبێت بەهانایانەوە لەو تەنگو چەڵەمەیە رزگاریان بکات. بەڵام وەك واتای زاراوە کەهەموو هەورامییەکان نازانن چی‌یە ئەوەندە نەبێت زاراوەکەیان بیستووەو دەیناسن.[11]

## ٢-دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی

**دەسەڵات:** بریتی‌یە لەلێوەشاوەیی لەبەرەنگاربونەوەداو بەدەست هێنانی وورە لەناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا.[12] یا بریتی‌یە لەو هێزە پەنانەکییە کەفەرمانڕەوا بەکاری دەهێنێت بۆ دابینکردنی کۆمەڵگا.[13]

---

[11] مصطفى حمە حسین أحمد، دەمودوو وەرگرتن، خەڵکی گوڵپ، لەدایکبوی ١٩٤٥، پارێزەر، بکالۆریۆس یاسا، دەرچوی زانکۆی بەغدا ١٩٧٦، لەڕۆژی ٢٤-١٠-٢٠٠٤ لەخانەی دادی سلێمانی ژووری پارێزەران ئەم زانیاریانەی لێوەرگیراوە.

[12] س. ی. بریوف، نقد علم الأجتماع البورجوازي المعاصر، ترجمة نزار عيون السود و د. الطيب تيزيني، دار دمشق للطباعة والنشر، بدون سنة طبع، ص١٣٢.

لێوەشاوەیی یا هێزی فەرمانڕەوا بەمیراتی، یا بەتوانا، یا بەپێسپاردن دەستی دەکەوێت. (ماکس فیبر) دەسەلآت ئەکات بەسێ بەشەوە لەجیهاندا کە(دەسەلآتی داب‌و نەریتی، دەسەلآتی کاریزمی، دەسەلآتی رەوا- زانستی)ن.

١-دەسەلآتی داب‌و نەریتی: بریتی‌یە لەو دەسەلآتەی کەفەرمانڕەوا لەباووباپیرانیەوە بەمیرات دەستی دەکەوێت، یاساو دەستوورو رەوایەت پەیڕەو ناکات، هێزو توانای داب‌و نەریت بڕیاردەرە لەسەر دیاریکردنی فەرمانڕەوا، فەرمان رەوا پاشایی‌یەکان‌و بنەمالەیی‌یەکان لەو جۆرەن.

٢-دەسەلآتی کاریزمی: بریتی‌یە لەو دەسەلآتەی کەفەرمانڕەوا خۆی بەدەستی دەهێنێت لەڕێی تواناکانییەوە، جا ئەو تواناییانە(ئازایەتی، زیرەکی، چاکەو مێرخاسی، فێڵبازی، توندوتیژی‌و خراپەو کەللەڕەقی) لەجۆرە کەسێکدا کۆ دەبنەوە کەئەو کەسە جیاواز دەبێت لەوانی تر، دەتوانێت لەو رێیەوە خۆی بسەپێنێت بەسەر دەستەو حیزب‌و چین‌و کۆمەڵگادا. ئەو دەسەلآتانە تاك رەوین‌و تاکە کەس خاوەن بڕیار دەبێت، دامودەزگا میری‌یەکان بێ دەسەلآتن‌و هیچیان پێ ناکرێت بەبێ رەزامەندی فەرمانڕەوا، سەرچاوەی بڕیار پشت بەبیروبۆچونی فەرمانڕەوا دەبەستن، رەوایەت‌و یاساو دەستوور پێشێل دەکرێن.

٣-دەسەلآتی رەوا- زانستی: بریتی‌یە لەو دەسەلآتەی کەکۆمەڵگا دەیسپێرێت بەکەسێك کەفەرمانڕەوایەتیان بکات بەپێی یاساو دەستوری دان پیانراوی کۆمەڵگاکە، ئەو دەسەلآتە لەڕێی هەڵبژاردن‌و ئەنجومەنەوە پەیدا دەبێت‌و دەسپێرێت بەکەسێك کەشیاوی فەرمانڕەوایی

---

[١٢] احسان محمد الحسن، رواد الفكر الأجتماعي دراسة تحليلية في تأريخ الفكر الأجتماعي، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩١، ص٣١٠- ٣١٢.

بێت‌و ئەرك‌و مافەكان بەپێی یاساو دەستوور بەڕێوە ببات، پێشی دەوترێت دەسەڵاتی(زانستی- عەقڵی). چونكە فەرمانڕەوا بەپێی یاساو دەستوور هەڵسوكەوت دەكات‌و دووردەكەوێتەوە لەئارەزوو و مەرام‌و بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەكانی خۆی، هەوڵدەدات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەكان. نموونەی ئەو دەسەڵاتەش هەموو دەسەڵاتە دیموكراتییەكان‌و گەلی‌یەكان‌و یاسایی‌یەكان‌و دەستوری‌یەكانن كە لەبەشێكی زۆری جیهاندا پەیڕەو دەكرێن.

ئەگەر بێتوو باسی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی كۆمەڵگای كوردەواری بكەین بەگشتی‌و فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵات لەكۆمەڵگای هەوراماندا بەتایبەتی دەتوانین بەم شێوەیە لەبەر رۆشنایی سەرچاوەو شوێنەوارەكاندا دەستنیشانی ئەو دیاردەیە بكەین كە لەناو كۆمەڵگاكە پەیڕەو كراوە.

## دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی لەكۆمەڵگای هەوراماندا:-

دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی لەكۆمەڵگای هەوراماندا تەم‌و مژاوی‌یەو بەڵگەی سەلمێنراوی زانستی بەدەستەوە نین بۆیە بەئاسانی رۆشن ناكرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی ئاسەواری بەجێماوو پاشماوەی دێرینی كۆن‌و ئەو(سەجەرانەی دەسەڵات) كە لەپێشەوە خراونەتە روو دەكرێت دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی كۆمەڵگای هەورامان لە(سێ قۆناغی) جیاجیادا دەست نیشان بكەین:-

قۆناغی یەكەم: ناتوانین لەم قۆناغەدا هیچ جۆرە بڕیارو بەڵگەیەكی سەلمێنراو بۆ دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی هەورامان دەست نیشان بكەین، ئەوەندە نەبێت كەهەندێك ئاسەوارو پاشماوەی دێرین بخەینە روو واتاكانیان بە(شێوەزاری هەورامی) بەدەستەوە بدەین كەتا ئێستا

بەکاردێن‌و پارێزراون‌و بەزیندویی ماونەتەوەو لەناو ئەو شێوەزارەدا ووتووێژو ئاخافتنی کۆمەڵگاکەن. بەم جۆرەی لای خوارەوە:

آنوبانینی:-[14] واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(زاراوەکە ناوێکی لێکدراوە، لەسێ ووشە پێکهاتووە، ئانە- ئامرازی دەستنیشان کردنە واتاکەی- ئەوە-،- بان- واتاکەی- سنوور-،- و- ئامرازی پەیوەندیە، - نی- ناوە، دەبێت ناوی فەرمانڕەوا یا پاشا بووبێت. زاراوەکە بەسەریەکەوە دەکاتە- تا ئەوێ سنوری پاشانی- یە).

کاسی، کاسای، کاشی، کەشی:[15] بەچوار جۆر ئەم زاراوەیە تۆمار کراوەو واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(-کەش- واتاکەی- شاخ- ، - کەشی- واتاکەی- شاخاوی). جۆرە فەرمانڕەوایەتییەك بووە کە لەسنوری مەندەلی‌و بەدرەو جسان‌و تادیالەی ئێستاو بابلیشیان گرتوە لەو سنورەدا بۆ ماوەی ٤٠٠ ساڵ پێش زایین فەرمانڕەوایەتیان کردوە.

هەشەزێنە: گوندێکە لەگەرمیانی ئێستا سەر بەچەمچەماڵە، واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(ناوێکی لێکدراوە لەدوو ووشە پێك هاتووە- هەشە- واتاکەی- وورچ- ، - زێنە- واتاکەی- زاوە-، بەسەریەکەوە زاراوەکە دەبێتە- وورچەکە زاوە-).

پشدەر: واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(ناوێکی لێکدراوە لەدوو ووشە پێك هاتووە- پشت- واتاکەی- دواوە- ، دەرە- واتاکەی- چەم-، بەسەریەکەوە دەبێتە- پشتی چەم-).

---

[14] کمال رشید رحیم، منحوتة دربند باسره، گۆڤاری هەزارمێرد ژمارە(٢٠)، حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢١١.

[15] ئەحمەد میزا رۆستەمی، کاسیەکان‌و حکومەتی کاسای، گۆڤاری هەزارمێرد ژمارە(١٢)، حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٣٧.

رانیە: واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(ناوێکی لێکدراوە لەدوو وشە پێك هاتووە- را- واتاکەی- رێگا- نیە- واتاکەی- نی‌یە-، بەسەریەکەوە دەبێتە- رێگانی‌یە-).

ئارابخا: واتای ئەم زاراوەیە بەشێوەزاری هەورامی ئەوەیە(ناوێکی لێکدراوە لەدوو وشە پێك هاتووە- ئەرێ- واتاکەی- بەڵێ-، باخا- واتاکەی- باخە-، بەسەریەکەوە دەبێتە- بەڵێ باخە-).

ئەم زاراوانەو سەدان زاراوەو ناوی تر لەسنورە جوگرافییەکانی دەوروبەری(خانەقین‌و کفری‌و کەرکوك‌و گەرمیان‌و قەرەداغ‌و کۆیەو تەق تەق‌و بتوێن‌و پشدەرو شارباژێڕو شارەزوور)دا واتاکانیان لەناو شێوەزاری هەورامیدا دەست دەکەون‌و پارێزراون‌و ئێستا لەئاخافتنی کۆمەڵگاکەدا بەکار دەهێنرێن ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە نوسراوەکانی(ئەکەدی‌و بابلی‌و ئاشوریەکان) کەباسی جەنگەکانیان کردووە لەگەڵ لۆلۆکاندا، ووتویانە(لۆلۆکان) شکان‌و چونەوە ناو چیاکان، نەیان ووتووە لەناومان بردن. کەواتە لۆلۆکان دەبێت نەوەو وەچەیان مابێت‌و لەچیاکاندا درێژەیان بەژیان دابێت. بەبەراورد کردنی شێوەزارەکانی تری زمانی کوردی لەگەڵ زمانی لۆلۆکاندا هیچ کامیان ئەوەندەی شێوەزاری(هەورامی) نزیکایەتیان نی‌یە لەگەڵ زمانی لۆلۆکاندا، هەروەها هەندێك زمانناس تەنانەت(محەمەد ئەمین زەکی)ش ووتویەتی((رەگەزی هەورامییەکان لەگەلانی قەوقازی دەچێت)).[16]
دیسان ووتویانە لۆلۆکان رەچەڵەکیان قەوقازی‌یە. ئەگەر ئەو بۆچونانەش راست بن لەوەشدا هەریەك دەگرنەوە. هەرچەندە بۆچونەکانیان بێ بەڵگەی زانستین. ئەوانە هەموویان راستی‌یەك بەدەستەوە ئەدەن ئەویش

---

[16] محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٠.

ئەوەیە(هەورامییەکانو لۆلۆکان) دەبێت پەیوەندییەکی مێژوویيان هەبێت. بەواتایەکی تر یەکێکیان ئەوی تریانە، یا هەورامییەکان لۆلۆن یا لۆلۆکان هەورامی بوون. چونکە بێ بنەما ئەو هەموو زاراوەو ناوو ووشە هەورامیانە لەو مەڵبەندە جوگرافییەدا بلاۆنەدەبونەوە کەسنوری دەسەلآتو فەرمانڕەوایەتی لۆلۆکان بووە تا پەیدابونی ئیمپراتۆریەتی ماد.

سەلماندنی ئەم راستیەش بەجێ دێلین بۆ مێژوونوسانو شوێنەوارناسانو زمانناسانی گەلی کورد. ئەگەر بۆیان راست کرایەوە، بێگومان کۆمەڵگای هەورامان دەسەلآتو فەرمانڕەوایی بەناوی(لۆلۆ، کەشی، هۆری)یەوە تاسنوری جوگرافی ئەو فەرمانڕەوایانەیان گرتۆتەوە لەسەردەمێکی مێژووییدا.

**قۆناغی دووەم:** لەکورتە مێژووەکەی هەوراماندا باسی ئەوە کرا، کەسوپای ئیسلام هەورامانی داگیرکرد وێرانیشی کرد کوشتارێکی زۆری خەڵکەکەشی کرد.[17] هەرچەندە هەمیشە خۆیان فەرمانڕەوایەتی خۆیان بوون.[18] بەجۆرێك لەپەلوپۆی خست کەژیانی رامیاریی کۆمەڵگای هەورامان بۆ ماوەیەکی دووردرێژ نەیتوانی خۆی دروست بکاتەوە، تا ئەوکاتەی کەدوو دەوڵەتی ئیسلامی بەهێز لەرۆژهەلآتو رۆژئاوای کۆمەڵگای هەورامان پەیدابوون. یەکێکیان دەوڵەتی ئیسلامی ئاینزا(شیعە) بەناوی دەوڵەتی سەفەوییەوە لەئێران دامەزرا، ئەوی تریان بەناوی خەلافەتی عوسمانی ئایینزا(سوننە) دەسەلآتی گرتە

---

[17] د. رەشاد میران، رەوشی ئایینیو نەتەوەیی لەکوردستاندا، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤-٤٧.

[18] حسام الدين علي غالب النقشبندي، الكرد في الدينور وشهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الآداب جامعة بغداد. غير منشورة، ١٩٧٥، ص٦١.

دەست. ئەو دوو دەوڵەتە ئیسلامییە کەوتونەتە ململانێی یەکترو شەڕ بەرپابووە لەنێوانیاندا، ئەو شەڕە ماوەیەکی دوورودرێژی خایاندوە هەردوو دەوڵەت شەکەتو ماندوو بون، لەو سەردەمەدا هەلێك رەخساوە بۆ گەلی کورد کەچەند میرنشینو فەرمانڕەوایەتیەکی(ناوچەیی) دامەزرێنێت، بەمەبستی خۆپاراستنیان لەئاگری ئەو شەڕەو رزگاربونیان لەدەسەلاتی داگیرکەران، بەلاّم بەبێ ئەوەی خواستی خۆیان بێت لەشەڕەکەوە گلاون.[19]

لەسنوری جوگرافی هەوراماندا دوو میرنشین پەیدابوون لەرۆژهەلاتەوە میرنشینی(ئەردەلاّن) بوە کەسەر بەدەوڵەتی سەفەوی بوە وەلەرۆژئاواوە میرنشینی(بابان)بوە کەسەر بەخەلافەتی عوسمانی بوە، کۆمەلگای هەورامان دابەش کراوە بەسەر ئەو دوو میرنشینەدا بەشی کەمی سەر بەبابانەکان بوە بەشی زۆریشی سەر بەئەردەلاّنەکان بوە.

لەو هەلو مەرجەدا هەلێك رەخساوە بۆ کۆمەلگای هەورامان کەفەرمانڕەوایەتی(خۆجێیی) دابمەزرێنێتو دەسەلاّتی ئەو فەرمانڕەوایەتیە بەناوی(سان نشینو خان نشین) فەرمانڕەوایەتی کۆمەلگاکەیان کردووە، کۆمەلگای هەورامان کاتێك کەئەو چینە دەسەلاّتدارەی تیاپەیدابوە بەهۆی لێزانیو وورییو فێلبازیو شارەزایی ئەو چینەوە، توانیویانە خۆیان بسەپێنن بەسەر کۆمەلگاکەداو بەناوی(سان نشینو خان نشین)ەوە کۆمەلگای هەورامان بەلای خۆیاندا راکێشنو مەرامو بەرژەوەندییەکانیان لەناو کۆمەلگاکەدا دەستەبەر بکەن.

بەپێی تیوری(النخبة أو الصفوة)ی(پاریتۆ) کەدەلێت کۆمەلگا لەدوو چین پێك دێت، چینی فەرمانڕەواو دەسەلاّتدار The Rulig

---

[19] عبدالفتاح علی یحیی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥-١٥٦.

Class، وەچینی ژێردەست The Ruled Class چینی فەرمانڕەوا خاوەن هێزو دەسەڵاتو پلەوپایەو موڵكو ماڵو زەویو زارو خاوەن بڕیارنو کەمینەن، چینی ژێردەست کەهەموو خەڵکەکە دەگرێتەوە خاوەنی هیچ نینو ملکەچی بڕیارەکانی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەواکاننو زۆرینەن.[20]

ئەو تیورەی سەرەوە پراوپڕ بەسەر کۆمەڵگای هەوراماندا دەچەسپێت کە لەو قۆناغە مێژوویی‌یەدا کۆمەڵگای هەورامان دووبەش(چین) بووە، بەشێکی یاچینێکی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەواکان بوون(دنیاییو ئایینی)و کەمینە بوون، ئەمانە دەست بەسنگەوە گیراوە بۆیانو ڕێزێکی زۆریان لێ گیراوە لەکۆمەڵگاکەدا وەخاوەنی هێزو دەسەڵاتو پلەوپایەی کۆمەڵایەتیو موڵكو ماڵو خاوەن بڕیار بوون. بەشی(چین)ی دووەمیان کە(زۆرینەن)و هەموو هەورامییە ڕەسەنەکانی کۆمەڵگاکە دەگرنەوە چینێکی بێ دەسەڵاتو ڕەنجدەرو زەحمەتکێش بوون هەژارو ڕەشو ڕووتو بێ زەویوزار بێ پلەوپایە بوون، بڕیارو فەرمانەکانی چینەکەی تریان جێبەجێ کردوننو ملکەچ بوون.[21]

چینی دەسەڵاتدار لەهەوراماندا(دوو) دەستەبوون، دەستەیەکیان(سانو خانو بەگ) بوە کەدەسەڵاتی دنیایی‌یان بەدەست بووە، دەستەی دووەم(شێخەکان، سەید، مەلا) بوون کەدەسەڵاتی ئایینیان لەئەستۆ بووە، ئەم دەسەڵاتدارانە لەناوخۆیاندا ناکۆك بوون، بەڵام بەرامبەر خەڵکە هەژارو ڕەشو ڕووتو بێ دەسەڵاتەکان(هەورامییە ڕەسەنەکان) یەك جۆر ڕامیاریان پیادە کردوە کەئەویش(بەهەژار کردنو ڕوتاندنەوەو ملکەچ پێکردننو ترسو تۆقاندن)بووە.[22]

---

[20] بیار لاروك، الطبقات الأجتماعیة، ترجمة جوزف عبود كبة، المصدر السابق، ص۲۲.

[21] احسان محمد حسن، رواد الفكر الأجتماعي، المصدر السابق، ص۳٤۱.

[22] شاکر فتاح، ڕۆژنامەی خورماڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل٤-٥.

**دەستەی یەکەم:-** بەپێی سەجەرەکەیان دەچنەوە سەر(بەهمەن) ناوێك جا کام بەهمەنیە ئەوە سەجەرەکەیان بەهەندێ کەمو کورتیەوە دەستنیشانی کردوە، ئەگەر(بەهمەن)ی کێوەکانی دەماوەند بێت یا بەهمەنی پێش داریوش بێت، یەکەمیان سالّی ٦٠٢- ٥٣٣ پ. ز بووە، ئەوی تریان سالّی ٤٨٥ پ. ز بووە، سەجەرەکە زۆر دوورە لەسەردەمی ئەمانەوە.[٢٣] کۆمەڵگای هەورامان لەسەدەی چوارەمی پێش زایین کەوتۆتە ژێر دەسەلاّتی(یۆنانەکان) کاتێك کە ئەسکەندەری مەکەدۆنی دوای شەڕی(گۆگامل) روی لەئێران کرد، هەورامان لەساڵی ٢٠٠ پ. ز کەوتە ژێر دەسەلاّتی(ئەرمەنەکان)، دوای ئەوانیش بوە بەبەشێك لەسەر زەمینی ساسانیەکان، بەدوای ئەوانیشدا سوپای ئیسلام داگیری کردوە لەسالّی ٦٣٩-٦٤١ز ئەو ماوەیە تا لاوازبونی دەسەلاّتی ئیسلامەکان ٨٤٠ سالّی خایاندووە.[٢٤]

کۆمەڵگای هەورامان لەو سەردەمەدا لەڕوی ژیانی رامیاریەوە گرێدراوی ئەو دەسەلاّتانە بوە کەداگیریان کردوە، بەواتا مێژوو هیچ فەرمانڕەوایی یەکی(خۆجێیی) لەهەوراماندا تۆمار نەکردوە، بەلاّم لەسالّی ٩٧١-١٠٥٦ز (بەهمەن) ناوێك تۆمارکراوە گوایە بە١٨ پشت ئەچێتەوە سەر بەهمەنی یەکەم.[٢٥] لەگەڵ ئەو نوسینەدا بەڵگەی سەلێنراو نەخراوەتە روو وە لەگەڵ سەجەرەکەیان پێك نایەتەوە، چونکە لەلایەکەوە لەگەڵ دەسەلاّتو فەرمانڕەوایی دەسەلاّتدارانی(ئەخمینی یەکانو یۆنانییەکانو ئەشکانییەکانو ئەرمەنییەکانو ساسانییەکان)دا ناگونجێت کە لەو کاتەدا هەورامان خاوەنی فەرمانڕەوایی خۆجێی خۆی

---

[٢٣] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣، ١٢٢.

[٢٤] محەمەد ئەمین هەورامانی، مێژوی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥-١١٧.

[٢٥] هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

بوبێت دوور لەدەسەڵاتی ئەو زل هێزانە، لەلایەکی ترەوە سەجەرەکە خۆی جێی گومانەو هەڵەی مێژوویی تیا بەدی دەکرێت.

کەواتە ئەو سەجەرەیە دەبێت بۆ مەبەستێك فەرمانڕەواکانی هەورامان بەو جۆرە ڕێکیان خستبێت، چونکە پێنجەم فەرمانڕەوای ئەردەڵانەکان ناوی(باڵوڵ)بوە لەهەوراماندا بە(باڵوڵە شێت) ناسراوە دوورنی‌یە، (باریە بەگ)[٢٦] کوڕی(باڵوڵ) بوبێت‌و دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگای هەورامان پەیوەندیەکیان بەباڵوڵ‌و باریە بەگەوە هەبێت‌و نەوەی ئەوان بن‌و لەوانەوە فەرمانڕەوایەتیان وەرگرتبێت، چونکە میرنشینی ئەردەڵان لەسەدەی ١٩دا لەحەوت ناوچەی سەرەکی پێکهاتوە: ١-جوانرۆ ٢-هەورامان ٣-مەریوان ٤-بانە ٥-سەقز ٦-ئیسفند ئاباد ٧-حەسەن ئاباد.[٢٧]

هەروەها(ئەمین زەکی) وتویەتی((بابا ئەردەڵان لەخانەدانێکی قەدیم‌و نەجیبی دیاربەکر بوو هیجرەتی کردبوە ناو عەشیرەتی گۆران، وە ئەوەندەی پێنەچوو نفوزی پەیداکردوو عەشایری شارەزوورو خێلانی دۆلانی شەرقی هەورامانی کرد بەتابعی خۆی)).[٢٨] دیارە لەو کاتەدا هەورامان فەرمانڕەوایی خۆجێیی نەبوە، لەنەوەکانی بابا ئەردەڵانەوە ئەو فەرمانڕەوایەتی‌یە ناوچەیی‌یە لەهەوراماندا پەیدابووە پشتاوپشت بەناوی(سان‌و خان‌و بەگ)ەوە فەرمانڕەوایەتی‌یان کردووە، ئەمانە پێیان باش نەبووە سەجەرەی فەرمانڕەوایەتی‌یەکەیان بە(باڵوڵە شێت)ەوە

---

[٢٦] شرفخانی بدلیسی، شرفنامە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٧.

[٢٧]حەمەد ئەمین زەکی، نازناز محەمەد عەبدلقادر، میرنشینەکانی کوردستانی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣٤.

[٢٨]خولاصەیەکی کوردو کوردستان-جلدی دووەم حکوماتو ئەمارەتانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٥.

ناوبانگی دەربکات بۆیە بالۆلیان گۆڕیوە بە(بەهمەن)وە سەجەرەیەکیشیان بۆ دروست کردووە.[29]

(قانع ی شاعیر)لەم هۆنراوەیەدا بەلگەیەك بەدەستەوە ئەدات کەدەلێت

یادگاری پاشی خۆی ناوێ(کلۆلّ)ە، بێ درۆ
پاشی ئەو(ئەلیاس)و(خدر)و(بابلو)*ی خاوەن عیتاب[30]

فەرمانڕەوایانی هەورامان لەو سەردەمەوە بەناوی بالۆلەوە ئەبێت دەست پێ بکات کەسەربەمیرنشینی ئەردەلان بوەو دەسەلاتو فەرمانڕەوایی کۆمەلگاکەیان گرتۆتە ئەستۆو فەرمانڕەوایەتی‌یەکی (خۆجێ‌یی) یان دامەزراندوەو جارێکی تر(ژیانی رامیاری هەورامان) دەستی پێکردوە کە لەنێوان سالەکانی(١٠٥٦-١٩٣١ز) بوە کە جافرسان لەهەورامانی لهۆن‌و مەحمود خانی دزلی‌و مەحمود خانی کانی سانان ١٩٢٨ لەهەورامانی تەخت کۆتایی بەدەسەلاتو فەرمانڕەوایەتی‌یان هاتووە.[31] بۆ زیاتر شارەزابوون لەسەجەرەی دەسەلاتدارانی هەورامان سەیری ئەو سەرچاوانە بکە کە لەپەراوێزدا نوسراون.**

---

[29] حەمەد ئەمین هەورامانی، مێژوی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦.

* (بابلو- دەبێت بالۆلّ بێت): کە لەکۆمەلگای هەوراماندا بە(بالۆلە شێت) ناسراوە.

[30] دیوانی قانع، کۆکردنەوەی بورهان قانع، چاپخانەی قانع، سلێمانی ٢٠٠٣، ل٧٢.

[31] عومەر مەعروف بەرزنجی، مەحموودخانی دزلی، چاپخانەی نوسینگەی ئازاد- سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٧٤. یا هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٨.

** بۆ سەجەرەی فەرمانڕەوایانی هەورامان قۆناغی دووەم هەمیری ئەم سەرچاوانە بکە:-
أ-سی. جی. ئەدمۆندز، کوردو تورك‌و عەرەب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢، ئەچنەوە سەر فەرمانڕەوایانی ئەردەلان.
ب-أ. م. مینتیشاشڤیلی، کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٠، ئەچنەوە سەر ئەردەلانەکان.

**دەستەی دووەم:-** دەسەڵاتی(ئایینی) كۆمەڵگای هەورامان بەدەست(شێخ، سەید، مەلا)كانەوە بوە كە لەژێر پەردەی ئاییندا بونەتە خاوەن دەسەڵات كە هیچیان لەدەسەڵاتدارانی دنیایی كەمتر نەبوە، بەڵكو زۆرینەی كۆمەڵگای هەورامانیان بەلای خۆیاندا راكێشاوە، چونكە تێكڕای خەڵكی هەورامان ئیسلامن‌و پەیڕەوی هەموو یاساو رێسا ئیسلامییەكانیان كردوە، شێخەكان هەرچەندە مێژووی سەرهەڵدانیان لەهەوراماندا زۆر دوورنی‌یە بەڵام بونەتە خاوەن پێگەو پلەو پایەی ئایینی‌و كۆمەڵایەتی نەك هەر لەناو كۆمەڵگاكەدا بەڵكو لەكوردستان‌و لەووڵاتە ئیسلامییەكانیشدا دەنگیان داوەتەوە. لەڕێی پێگە ئایینی‌یەكەیانەوە لەهەوراماندا بونەتە خاوەنی چاكترین زەوی‌و زارو باخ‌و باخاتی هەورامان‌و موڵك‌و ماڵ‌و خانووبەرەیەكی زۆریان بۆ خۆیان دەستەبەر كردوە، چەند خانەقاو مزگەوتێكیان لەسەر رەنجی شانی كۆمەڵگای هەورامان دروست كردوە كەبونەتە جێگای خوێندنی زانستە ئیسلامییەكان. وەك لەلاپەڕە(٣٤)دا نیشان دراوە. (شێخەكان) بەرەچەڵەك‌و بەپێی سەجەرەكەیان هەورامی نین، بەڵكو بوون بەهەورامی. شێخەكانی هەورامان عەرەبن‌و لەسەیدەكانی(نعێم)ن لەكاتی(سەید قڕانی) سەردەمی عەباسییەكاندا باپیرە گەورەیان بەناوی(سەید ظاهر)ەوە هەڵهاتوەو روی كردوەتە هەورامان‌و بەمەبەستی

---

ج-محەمەد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٨، ٦٦٦. لەم سەرچاوەیەدا لەلاپەڕە ٥٧٢ كۆمەڵێك هەڵەی مێژوویی تیا بەدی دەكرێت، بەبەراورد لەگەڵ پەیامی هەورامان- هادی رەشید بەهمەنی‌دا لە ل١١٣، ١٢٢، ١٢٣دا.

د/هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧ دەچنەوە سەر بنەماڵەی ئەردەلانەكان. كەچی لەپێشەوە دەچنەوە سەر(ساسانی فارس)ەكان، بەو پێیە سەجەرەكە گومانی لەسەرەو دروستكراوەو راست نی‌یە.

خۆ حەشاردان‌و خۆشاردنەوە.[٣٢] دوایی نەوەکانی بونەتە خاوەنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌و لەسەردەمی شێخ عوسمانی تەوێڵە(سیراجەدین ١٧٨١-١٨٦٧ز)دا کاتێك کەبوە بەخەلیفەی مەولانا خالد بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی سۆفیگەری لەهەوراماندا ناوو ناوبانگی بڵاوبۆتەوە.[٣٣] لەسەردەمی ئەو بەدواوە ئیتر شێخەکان دەستیان گرتوە بەسەر چاکترین زەوی‌وزارو موڵك‌و ماڵ‌و باخ‌و باخاتی کۆمەڵگای هەوراماندا لەژێرپەردەی خواپەرستی‌و ئایینداا ئەو دەسەڵاتدارانە دەستەی یەکەم‌و دەستەی دووەم(دنیاییەکان، ئایینی‌یەکان) لەناوخۆیاندا ناکۆك‌و ناتەبا بوون. بەڵام بەرامبەر کۆمەڵگای هەورامان یەك جۆر رامیاریان پیادەکردوە کە لەسەر(بەهەژارکردن‌و داگیرکردنی زەوی‌وزارو باخ‌و باخات‌و ملکەچ پێکردنی کۆمەڵگاکەو ترس‌و تۆقاندنیان‌و ئاوارەکردن‌و دەربەدەرکردنیان‌و رسواکردن‌و تەنانەت کوشتن‌و زیندانی کردنیان) دامەزراوە. بەکورتی لەقۆناغی فەرمانڕەوایی خۆجێیی هەورامان هەر سێ دەردەکە(نەخۆشی، نەخوێندەواری، هەژاری) سەریان کردبوە کۆمەڵگای هەورامان‌و لەجوڵەیان خستبوو.[٣٤]

بەڕای توێژەر ئەو باسەی پێشەوە ئەم خاڵانەی لای خوارەوەی لێ پەیدا دەبن:-

١-بەپێی سەجەرەی(سان‌و خان‌و بەگ) چ ئەوەی دەگەڕێتەوە سەر(بەهمەن) یا ئەوەی دەگەڕێتەوە سەر(باڵوڵ) ئەمانە هەورامی

---

[٣٢] محەمەد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

[٣٣] مەلا عەبدول کەریمی مودەرس، گۆڤاری رۆژنامەی(١٤) ژمارە(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

[٣٤] شاکر فتاح، رۆژنامەی خورماڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل٤-٥.

پێویستی‌یه‌كانی ئابووری‌و كۆمه‌لآیه‌تی‌و رامیاری‌ی جوگرافی په‌یڕه‌وی دیارده‌ی ژماره زۆری خێزان ده‌كه‌ن.

### ٢-سیما جوگرافی‌و كۆمه‌لآیه‌تی‌یه‌كانی نموونه‌ی توێژینه‌وه یه‌كه‌كان‌و شوێنی نیشته‌جێ بوون:-

دابه‌ش بونی دانیشتوان‌و چڕی دانیشتوان یه‌كێكه له‌باسه‌كان كه‌زانایان جه‌ختی له‌سه‌ر ده‌كه‌نه‌وه، ئه‌و دیارده‌یه جیاوازی هه‌یه له‌وولآتێك بۆ وولآتێكی تر وه له‌ناوچه‌یه‌ك بۆ ناوچه‌یه‌كی تر له‌ناو سنوری یه‌ك وولآتدا، ئه‌وه‌ش له‌ئه‌نجامی كاریگه‌ری چه‌ند فاكته‌رێكه‌وه په‌یدا ده‌بێت كه‌پێشه‌نگیان ئه‌مانه‌ن فاكته‌ری(جوگرافیایی، ئابووری، كۆمه‌لآیه‌تی، دیمۆگرافی... هتد).

یه‌كه‌كانی پێكهاته‌ی كۆمه‌لگای هه‌ورامان له‌ڕوی نشینگه‌وه ئه‌مانه‌ن(شارۆچكه، دێ، لادێ). بێگومان ئه‌و فاكته‌رانه‌ی سه‌ره‌وه كاریگه‌رییان هه‌بوه له‌سه‌ریان، بۆیه تا ئێستا هه‌ندێكیان چڕی دانیشتوانیان زۆره‌و هه‌ندێكی تریان كه‌مه، هه‌ندێكیان ئاوه‌دان نه‌كراونه‌ته‌وه. بۆیه به‌نارێكی فۆرمه‌كانی راپرسی به‌سه‌ر نموونه‌ی توێژینه‌وه‌دا دابه‌ش بوون. له‌خشته‌ی(٦)دا خراونه‌ته روو.

خشته‌ی(٦)

یه‌كه‌كانی پێكهاته‌ی كۆمه‌لگای هه‌ورامان‌و شوێنی نیشته‌جێ بوونی ئه‌ندامانی نموونه‌ی توێژینه‌وه نیشان ده‌دات.

| یه‌كه‌كان | ژماره‌ی فۆرم | رێژه% |
|---|---|---|
| شارۆچكه | ٩٩ | %٦٦ |
| دێ | ٢٤ | %١٦ |
| لادێی ئاوه‌دان | ٢٧ | %١٨ |
| كۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەخشتەی(٦)دا دەرکەوتوون. لەکۆی نموونەی توێژینەوەکە(١٥٠) خێزانە. لە(٢) شارۆچکەدا ژمارەی فۆرمەکانی کە بەسەر نموونەی توێژینەوەدا دابەش بوون دەکاتە(٩٩) فۆرم کە بەرێژەی(٦٦٪). وە لە(٤) دێدا ژمارەی فۆرمەکانی کە بەسەر نموونەی توێژنەوەدا دابەش بوون دەکاتە(٢٤) فۆرم کە بەرێژەی(١٦٪). وە لە(٩) لادێی ئاوەدان کراودا ژمارەی فۆرمەکانی کە بەسەر نموونەی توێژینەوەکەدا دابەش بوون دەکاتە(٢٧) فۆرم کە بەرێژەی(١٨٪).

لەخشتەکەدا ئەوە خراوەتە روو کەفۆرمەکان بەیەکسانی بەرێك‌وپێکی بەسەر شارۆچکەو دێو لادێکاندا دابەش نەکراون هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆرو کەمی ژمارەی ئەو خێزانانەی کە گەڕاونەتەوە هەورامان‌و ئێستا لەهەورامان دەژین. لەشارۆچکەکاندا ژمارەی خێزانەکان زۆرترە بۆیە فۆرمی زیاتریان بەرکەتوون. بەڵام لەدێو لادێکاندا ژمارەی خێزانەکانیان کەمن بۆیە فۆرمی کەمیان بەرکەوتوون.

## چینەکانی کۆمەڵ

کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی جیاوازیان هەیە لەئەنجامی کاریگەری کۆمەڵێك فاکتەر وەك(ئابووری، کۆمەڵایەتی، رامیاری، فەرهەنگی‌و رۆشنبیری... هتد).[٣]

نموونەی توێژینەوەکەمان لەکۆمەڵگای هەوراماندا بەپێی فۆرمی راپرسی‌یەکە لە(سێ) چینی کۆمەڵایەتی پێك هاتووە کەئەمانەن(گشتی خەڵك، شێخ، بەگ) بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی. لەخشتەی(٧)دا خراونەتە روو.

---

[٣] بیار لاروك، الطبقات الأجتماعية، المصدر السابق، ص٢٢،٣٧.

خشتەی(٧)

نموونەی توێژینەوەکە چینە کۆمەڵایەتی‌یەکانی کۆمەڵگای هەورامان نیشان دەدات بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی

| چینەکانی کۆمەڵایەتی | ژمارە | رێژە% |
| --- | --- | --- |
| گشتی خەڵك | ٩٨ | ٦٥,٣٣ |
| بەگ‌و سان | ٢٢ | ١٤,٦٧ |
| شێخ | ٣٠ | ٢٠ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە کە لەخشتەی(٧) دەرکەوتوون. پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگاکە بەم جۆرەیە، گشتی خەڵك رێژەکەی(٦٥,٣٣%). بەگ‌و سان رێژەکەی(١٤,٦٧%). شێخ رێژەکەی(٢٠%).

ئەو خشتەیەی سەرەوە کە لەڕاپرسی‌یەکەوە سەرچاوەی گرتووە راستی‌یەکی سەلماندووە کە کۆمەڵگای هەورامان یەك عەشیرەت‌و یەك تیرە نی‌یە، بەڵکو کۆمەڵگایەکەو لەچەند یەکەیەکی نشینگەیی پێك هاتووە کەئەمانەن(شارۆچکە، دێ، لادێ) ئەوە لەسەر بنەمای نشینگە بوو، یا لەچەند یەکەیەکی مرۆیی پێك هاتووە وەك(تاك، خێزان، بنەماڵە). هەروەها بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی لەچەند چینێك پێك هاتووە لەسەر بنەمای چینایەتی کەبریتی‌یە لەم چینانە: گشتی خەڵك، شێخ، بەگ‌و سان. بەڵام لەو رووەوە کەئاستی گوزەران یەکێکە لەپرسیارەکانی فۆرمی راپرسی زۆرینەی خەڵکەکە بەمام ناوەند وەڵامیان داوەتەوە وەڵامەکانیان لەگەڵ زانیارییەکانی ترا ناگونجێت بۆ نموونە لەگەڵ پرسیاری ئاستی گوزەراندا رێك ناکەوێت.

هەروەها ئەو راستی‌یە دەرکەوتووە کەگشتی خەڵك بەتەنها ژمارەیان‌و ڕێژەیان لەکۆی هەردوو چینەکەی تر زیاترە. وە ژمارەو ڕێژەی شێخ لەژمارەی بەگ‌و سانەکان زیاترە.

**باری خێزانی**

باری خێزانی ڕۆڵ‌و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەبواری توێژینەوە زانستییەکاندا، کەگوزارشت لەدامەزراندن‌و سەقامگیری‌ی کۆمەڵگاکان دەکات لەلایەك‌و لەلایەکی ترەوە ئەوە نیشان دەدات لەو کۆمەڵگایەدا بەپلەی یەکەم خێزان بەرپرسیارە لەزۆربون‌و بەخێوکردن‌و پەروەردەکردن‌و فێرکردن‌و سەلامەتی دەرونی ئەندامەکانی.[٤] لەفۆرمی ڕاپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردوە بە(بەڵێ) وەڵام دراوەتەوە، واتا هەمویان خێزاندار بوون لەڕاستیدا ئەم پرسیارە وەك پەیڕەوکردنی هەنگاوەکانی ڕێبازی توێژینەوە دانراوە هەرچەندە زیادبوە چونکە توێژینەوەکە(خێزان)ی کردۆتە نموونەی توێژینەوەکەو(١٥٠) سەرەك خێزان دەستنیشان کراون ئیتر پێویستی نەدەکرد پرسیار بکرێت ئایا خێزانداریت یان بێ خێزان؟ ئەگەر بێ خێزانیت... بەهەرحاڵ نموونەی توێژینەوەکەمان(١٥٠) سەرەك خێزان بوەو هەمویان خێزانداربون، زۆرینەی خاوەن خێزانەکان لەڕەگەزی نێر پێك هاتبون‌و کەمینەیان لەڕەگەزی مێ بوون وەك لەخشتەی(٤)دا نیشان دراوە. ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێت لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا سەقامگیری‌و دامەزراندن بەرجەستە کراوەو خێزان بەپلەی یەکەم بەرپرسیارە لەزۆربوون‌و بەخێوکردن‌و پەروەردەکردن‌و فێرکردن‌و سەلامەتی دەرونی ئەندامەکانی وە هیچ کەسێك نیە کەسەر بەخێزانێکی دیاری کراو نەبێت لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا. هەروەها

---

[٤] د. اسماعيل محمد هاشم، المصدر السابق، ص١١٣-١٢٠.

خێزان بەبچوکترین یەکەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای هەورامان دادەنرێتو زۆرترینو گرنگترین رۆڵو ئەرك دەبینێت لەدابینکردنی کۆمەڵایەتیو پەرەپێدانو گەشەکردنی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو رامیاریو ئایینیو رۆشنبیریو فەرهەنگی لەکۆمەڵگاکەدا.

### ٣-سیما ئابووریەکان

سیما ئابووریەکانی نموونەی توێژینەوە بریتین لە(خاوەندارێتی خانوو، ئاستی گوزەران، پیشە). ئەو سیمایانە هەریەکەیان رۆڵو گرنگیو تایبەتمەندی خۆی هەیە لەبواری توێژینەوە زانستیەکاندا کەگوزارشت لەژیانی کۆمەڵایەتی نموونەی توێژینەوەکە دەکەن. ئەو سیما ئابووریانە لەنموونەی توێژینەوەکەماندا کە گوزارشت لەژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای هەورامان دەکەن ئەمانەن:

خاوەندارێتی خانوو:-

خاوەندارێتی خانوو لەنموونەی توێژینەوەکەماندا کە یەکێك بووە لەپرسیارەکانی فۆرمی راپرسی توێژینەوەکە ئاراستەی نموونەکە کراوە، زۆرینەی وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە بە(بەڵێ)بوە. واتا هەموو خاوەنی خانووی خۆیان بوون. ئەم وەڵامەش گوزارشت لەوە دەکات کەخێزان لەهەوراماندا بەتەنگ خاوەندارێتیی شوێنی نیشتەجێ بونەوەیەو لای پەسەند نیـیە جێگۆرکێ بکات. هەروەها کردنەوەی خانوو شوێنی نیشتەجێ بوون لەهەوراماندا کەمی تێ دەچێت، بەئاسانی کەرەستەکانی دەستەبەر دەکرێن کە کەرەستەکانی پێك هاتوە لەدارو بەردو خۆڵ کەهەمویان بە ئاسانی دەست دەکەونو زۆریان تێ ناچێت، ئەوەی بیەوێت خانوو بکات کەمێك سەرمایەی هەبێت بۆ کرێی وەستاو کرێکار دەتوانێت خانوو بکات. چونکە جۆری خانوەکان سادەو

ساکارنو تەنها بۆ پێویستی‌یەکان دەکرێن‌و زیادەو جوانکاری لەخانوو کردندا پەیڕەو ناکرێت، بەڵام خانووبەرەی هەورامان لەگەڵ خانووبەرەی لادێ‌و دێ‌کانی تری کوردستان تایبەتمەندی خۆی هەیەو خەڵکی ناوچەکە شارەزایی‌یەکی باشیان هەیە لەکردنەوەی خانوەکانیاندا.

**ئاستی گوزەران**

ئاستی گوزەران لەنموونەی توێژینەوەکەماندا کە یەکێك بووە لەپرسیارەکانی فۆرمی راپرسی توێژینەوەکە کەئاراستەی نموونە کراوە، زۆرینەی وەڵامی نموونە بە(بەڵێ) بووە لەخانەی(مام ناوەندی)دا. ئەوەش راستی‌یەك نیشان دەدات کەئەویش ئەوەیە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگاکە پەیوەندی‌یەکی ئابووری یەك چەشنە بە یەکیەوە بەستون‌و پیشەکەیان کە گوزەرانیانی لەسەر بەندە نزیکە لەیەکەوەو دووریش نی‌یە زۆرینەیان لەیەك پیشەدا کار بکەن. هەروەها دوور نی‌یە لەبەر جۆری پرسیارەکان‌و فۆرمی راپرسی‌یەکە هەموویان بەیەك جۆر وەڵامیان دابێتەوە، چونکە لە١٥٠ فۆرمدا ناکرێت تاکە یەك کەس خۆی بەهەژار یان دەوڵەمەند نیشان نەدات، هەر هەموویان ئاستی گوزەرانیان مام ناوەند نیشان داوە، چونکە بەپێی پێکهاتەی چینایەتی‌و بەپێی جیاوازی پیشەکەیان دەبێت جیاوازی‌یەك هەبێت لەرووی ژیان‌و گوزەران‌و بژێوی خێزانەکان کە هەندێکیان لەچینی دەسەڵاتداری ئایینی‌و هەندێکی تریان لەچینی دەسەڵاتداری رامیارین‌و بەشێکی زۆریشیان فەرمانبەرن. کەهەریەکە لەوانە سەرچاوەی ئابووری‌و گوزەرانیان لەوی تر جیاوازە، کەواتە دەبێت ئاستی گوزەرانیشیان جیاوازی هەبێت‌و پێکهاتەی چینایەتیان لەڕوی ئابوریەوە جیاواز بێت، واتا دەبێت هەژارو مام ناوەندو دەوڵەمەند هەبێت.

### پیشە

جۆرو کارو پیشەی ئەندامانی هەچ کۆمەڵگایەك بگریت گوزارشت لەسیماو جموجوڵو چالاکی ئەو کۆمەڵگایە دەکات لەبوارەکانی ژیاندا.

پیشەی ئەندامانی نموونەی توێژینەوەکەمان پرسیارێك بووە لەفۆرمی راپرسیدا کەئاراستەی نموونەکە کراوە، لەخشتەی(٨) خراونەتە روو.

خشتەی(٨)

کارو پیشەی نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات

| جۆری پیشە | ژمارە | رێژە% |
| --- | --- | --- |
| جوتیار | ١٣ | ٨,٦٦ |
| کاسبکار | ٢٧ | ١٨ |
| فەرمانبەر | ١٠٢ | ٦٨ |
| پیشەی تر | ٨ | ٥,٣٤ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٨) دەرکەوتون. رێژەی جوتیار(٨,٦٦%). رێژەی کاسبکار(١٨%)، رێژەی فەرمانبەر(٦٨%). رێژەی پیشەی تر(٥,٣٤%) بووە.

بەپێی ئەو زانیاریانە کە لەخشتەکەدا دەرکەوتون پیشەی زۆرینەی نموونەی توێژینەوەکە(فەرمانبەر) بوون. کە ژمارەیان(١٠٢) سەرەك خێزانە وە بەرزترین رێژەشیان هەیە کە(٦٨%).

کۆمەڵگای هەورامان کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵیە بەرزیی رێژەی فەرمانبەرانی نموونەی توێژینەوەکە راستییەك بەدەستەوە دەدات ئەویش

ئەوەیە، کەخەڵکانی هەورامان وازیان لەپیشە سەرەکی‌یەکەیان هێناوەو دامەزراون‌و بوون بەموچەخۆر، ئەوەش کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر کشتوکاڵ‌و ئاژەڵداری‌و پیشە دەستی‌یەکانی کۆمەڵگای هەورامان کەبەوانەوە بەناوبانگ بووە. ئەگەر بەو پێ‌یە بڕوات لەدوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێکی تر پیشە سەرەکی‌یەکانی کۆمەڵگای هەورامان لەناودەچن‌و دووریش نی‌یە ناوو ناوبانگی هەورامان بەرەو پوکانەوەو لاوازبون بچێت. وەپیشەی تر جێی ئەو پیشانەی ئێستایان بگرنەوە. بەڕای ئێمە ئەم دامەزراندنە زۆربەی دوای ڕاپەڕین پەیدابوەو دەرکەوتوە کەئەوەش لایەنی چاك‌و لایەنی خراپیشی هەیە، لەلایەکەوە ئەو خەڵکە بڕێك موچە وەردەگرێت‌و هەندێك لەپێویستییەکانی ڕۆژانەی پێ دابین دەکات هەرچەندە بەرهەمیشی نیە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك بەخشیش‌و پاداشتێك ئەو دەست پێشخەرییەی کردوە کەخەڵك دابمەزرێت ئەوە لایەنە چاکەکەی بوو، بەڵام لایەنی خراپیشی هەیە ئەو تازە موچە خۆرانە فێری تەمبەڵی دەبن‌و پشت دەکەنە پیشەو کارەکانیان کەسەرچاوەی سەرەکی ژیان‌و بژێویان بون لەدێرزەمانەوە هەر ئەوەش دەبێتە هۆی کەم بونەوەی بەرهەم هێنان‌و دووریش نی‌یە زۆرینەی پیشە خۆماڵیەکانیش لەماوەیەکی نزیکدا نەچنە قۆناغی بیرچونەوەو ئەوسا خەڵکەکە دەبێتە بەکاربەرو هیچ بەرهەمێکی نابێت.

پیشەی سەرەکی کۆمەڵگای هەورامان لەماوەیەکی دوورودرێژدا کشتوکاڵ کردن‌و باخ‌و ڕەزدانان‌و ئاژەڵ بەخێوکردن‌و جۆرەها پیشەی دەستی خۆماڵی بوە ئەو پیشانە ئەوەندەیان بەرهەم هەبوە کە بەشی هەرەزۆری پێداویستییەکانی خەڵکی هەورامانیان پڕ کردۆتەوە، هەندێکیشیان زیاد بوەو بازرگانیان پێوە کردوە لەگەڵ دەرودراوسێکانی کۆمەڵگای هەوراماندا. بەڵام بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستن‌و کاولکردنی

کوردستان بەگشتیو هەورامان بەتایبەتی ئەو کۆمەڵگایە تووشی زیانێکی زۆر بوە لەڕوی کۆمەڵایەتیو ئابوریو فەرهەنگیو رۆشنبیریەوە بەجۆرێك کەخەڵکەکەی ئێستای هەورامان ناتوانن ئەو کەلێنە گەورەیە پڕ بکەنەوە.

## ٤-سیما رۆشنبیری‌یەکانی نموونەی توێژینەوە

ئاستی خوێندەواری

ئاستی خوێندەواری لەبواری توێژینەوە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا زۆر گرنگی پێ دەدرێت، چونکە ئەو ئاستە کاریگەری هەیە لەسەر شێوەی بیرکردنەوەی مرۆڤو باری ژیانو بژێویو پلەو پایەی کۆمەڵایەتیو پێش کەوتنی کۆمەڵگا.[5] ئاستی خوێندەواری لەنموونەی توێژینەوەکەماندا لەکۆمەڵگای هەورامان جیاوازی هەیە، لەفۆرمی راپرسی‌یەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەکە کردووە. لەخشتەی(٩) خراوەتە روو.

خشتەی(٩)

نموونەی توێژینەوەکە ئاستی خوێندەواری کۆمەڵگای هەورامان نیشان دەدات

| ئاستی خوێندەواری | ژمارە | ڕێژە% |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ٨ | %٥,٣٤ |
| سەرەتایی | ٣٢ | %٢١,٣٣ |
| ناوەندی | ٣٢ | %٢١,٣٣ |
| ئامادەیی | ٦٠ | %٤٠ |
| خوێندنی باڵا | ١٨ | %١٢ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

[5] د. یونس حمادی علي، المصدر السابق، ص٣٣٩.

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٩) دەرکەوتون. ڕێژەی نەخوێندەوار(٣٤,٥%)، ڕێژەی خوێندنی سەرەتایی(٢١,٣٣%)، ڕێژەی خوێندنی ناوەندی(٢١,٣٣%)، ڕێژەی خوێندنی ئامادەیی(٤٠%). ڕێژەی خوێندنی زانکۆ(١٢%) بووە. هەروەها(ناوەندی خوێندن)ی ئاستی خوێندەواری نموونەی توێژینەوەکە تێکڕای خێزانەکان دەکاتە(٣٠)، بەڕێژەی(٢٠%). ئەو ئاستی خوێندنەی نموونەی توێژینەوەکە راستییەك بەدەستەوە دەدات کەئەویش ئەوەیە ئاستی تێکڕای خوێندەواری(نزمە). هەرچەندە ژمارەی نەخوێنەوار(٨) سەرەك خێزان بووە بەڕێژەی(٣٤,٥%). بەرزترین ئاستی خوێندەواری پلەی ئامادەیی بووە کە(٦٠) سەرەك خێزانە کەرێژەی(٤٠%)ی نموونەی توێژینەوەکە دەگرێتەوە. بەڵام بەپێی نموونەی توێژینەوەکە کۆمەڵگای هەورامان تێکڕا ئاستی نەخوێندەواریان کەمە بەشی هەرە زۆری خەڵکەکەی بەنێرو مێوە خوێندەوارن دەتوانن کاروباری رۆژانەیان راپەڕێنن بەبێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر هۆکاری یارمەتیدەرەوە. هەر ئەوەشە بوەتە یارمەتیدەریان کەئاستی هوشیاریان باش بێتو کێشەو گیروگرفتیان کەم بێتو زۆر بەتەنگ لەش ساغیو تەندروستی خۆیانەوە بێنو نەخۆشی کەم بێت لەناو کۆمەڵگاکەدا.

## بەشی دووەم

# شیکردنەوەی ئەنجامی توێژینەوە پراکتیکییەکە

باسی یەکەم/ ژینگەو ژیان.

باسی دووەم/ ژیانی کۆمەڵایەتی.

باسی سێیەم/ ژیانی ئابوری.

باسی چوارەم/ ژیانی ئایینی.

باسی پێنجەم/ ژیانی رامیاری.

باسی شەشەم/ ژیانی رۆشنبیریو فەرهەنگی.

## باسی یەکەم

# ژینگەو ژیان

هەروەك ئاشكرایە جوگرافیا كاریگەریی هەیە لەسەر چالاكییەكان‌و جم‌وجوڵەكانی مرۆڤ لەهەموو بوارەكانی ژیاندا. سەبارەت بەو كاریگەریانە لەفۆرمی راپرسیەكەدا پێنج پرسیارمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەكە كردووە كە لەخشتەی(١٠) خراونەتە روو.

خشتەی(١٠)

رای نموونەی توێژینەوەكە نیشان دەدات لەسەر كاریگەری جوگرافیا بۆ سەر چالاكییەكان‌و زۆرو كەمی ژمارەی دانیشتوان‌و شێوەزاری هەورامی‌و لاوازبونی رۆڵی جوگرافیا لەپاشەرۆژداو بەدەست هێنانی ئاوات‌و ئامانج.

| ژ | كاریگەری ژینگە لەسەر ژیان | ژمارەی نموونە | بەڵێ | نەخێر | كۆی گشتی | رێژە % |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئایا ژینگەی هەورامان كاریگەری هەیە لەسەر چالاكیەكانتان؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |
| ٢ | ئایا ژینگەی هەورامان پەیوەندی هەیە بەزۆرو كەمی ژمارەی دانیشتوانەوە؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |
| ٣ | ئایا ژینگە پەیوەندی هەیە بەشێوەزاری هەورامی‌یەوە؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |

| ٤ | ئایا رۆڵی ژینگە لاواز دەبێت لەپاشەڕۆژدا؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥ | ئایا ژینگەی هەورامان ڕێگرنەبوە لە بەدەست هێنانی ئاوات و ئامانجەکانتان؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە کە لەخشتەی ژمارە (١٠)دا دەرکەوتوون لەوەڵامی ئەو پێنج پرسیارەی سەرەوە یەك دەنگ بوون و هەمویان بە(بەڵێ) وەڵامیان داوەتەوە کەرێژەکەی بۆ هەر پرسیارێك دەکاتە(١٠٠%). ئەوەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە کەفاکتەری ژینگە کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای هەورامان. جائەو کاریگەریانە ڕاستەوخۆ بن یا ناڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر هەموو جموجوڵ و چالاکییە ئابوورییەکانی کۆمەڵگاکەو هەروەها کار دەکەنە سەر زۆرو کەمی ژمارەی دانیشتوان و، وە تایبەتمەندی کلتوری کۆمەڵگاکەو تەنانەت مانەوەی شێوەزاری هەورامی و نەتواندنەوەی و پاکی ووشەو ڕستەکانی پەیوەندیی هەبوە بەکاریگەری ژینگەکەیەوە. هەروەها ژینگەی هەورامان جگە لەوەی سروشتێکی جوانی ڕەخساندوە بۆ کۆمەڵگاکە لەگەڵ ئەوەشدا ئاستەنگ و ڕێگرێك بووە کە کۆمەڵگاکە دابڕێت و پەیوەندی کەم بکاتەوە بەدنیای دەرەوە. هەروەها سەختی ژینگەی هەورامان ڕێگرێك بوە لەبەردەم دوژمنانی گەلی کوردا بەگشتی و کۆمەڵگای هەورامان بەتایبەتی کە بەئاسانی داگیرنەکرێت و بەرگری لەخۆی بکات. ژینگەی هەورامان کاریگەری هەبوە لەسەر پێش خستن و پاراستنی هونەرو کلتوری کوردەواری.

## باسی دووەم

# ژیانی کۆمەڵایەتی

تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای هەورامان: هەر گروپ‌و کۆمەڵێك بگریت، چەند خسڵەتێکی هاوبەشیان هەیە، بەهۆی کاریگەری (جوگرافیاو باری کۆمەڵایەتی‌و پەروەردەو فێرکردن‌و... هتد). دیارە گەلی کورد بەگشتی‌و کۆمەڵگای هەورامان بەتایبەتی بێبەش نییە لەکۆمەڵێك خسڵەتی تایبەتمەند بەکۆمەڵگاکەوە، کە بەهۆی کاریگەری فاکتەرەکانی جوگرافی‌و رامیاری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و کلتوری کۆمەڵگاکەوە، پەیدا بوون، لەو بارەوە لەرێگای فۆرمی راپرسییەکەوە دوو پرسیارمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردون. لەخشتەی(١١) خراونەتە روو.

خشتەی(١١)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر تایبەتمەندیەکانی ژیان لەکۆمەڵگای هەوراماندا

| ژ | تایبەتمەندیەکانی ژیان | ژمارە | بەڵێ | نەخێر | کۆی گشتی | رێژە% |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی کۆمەڵگای هەورامان شێوەی هەڵسوکەوتی هەورامیەکانە؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |
| ٢ | ئایا ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی هەورامان تایبەتمەندە؟ | ١٥٠ | ١٥٠ | - | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١١) دەرکەوتوون. لەوەڵامی ئەو دوو پرسیارەدا یەك دەنگ بوونو هەموویان بە(بەڵێ) وەڵامیان داوەتەوە بەرێژەی(١٠٠٪).

دیارە بەپێی وەڵامەکەیان کۆمەڵگای هەورامان لەڕوی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە جیاوازیان هەیە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی دەوروبەریاندا جا ئەو تایبەتمەندیانە بەهەڵسوکەوتو خووڕەوشتو دابو نەریتو ڕێو ڕەسمەکانو تەنانەت جۆری بەرهەمهێنانو جلوبەرگو پیشە دەستی‌یەکانو ئاهەنگو شایی‌و ماتەمینی‌و جیاوازی شێوەزارەکەیانەوە تایبەتمەندی پێوە دیارە. هەر ئەوانەشە وای کردووە کەنموونەی توێژینەوەکە تێکڕای وەڵامەکانیان لەسەر ئەو دوو پرسیارە کە لەسەرەوە کراون یەك دەنگ بوونو وەڵامەکەیان جیاوازی نەبوە.

ئێمە ئەو ماوەیە کە لەناو کۆمەڵگاکەدا ماینەوە هەستمان بەو راستی‌یە کردوە کەکۆمەڵگای هەورامان لەڕوی کۆمەڵایەتی‌یەوە تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە بەهەڵسوکەوتو گفتوگۆو مامەڵە کردن لەگەڵ میوانو ڕێبوارو هەژارو دەست کورتو کەم دەست ئەو تایبەتمەندی‌یانە دیارن. هەروەها پیشەگەری‌و پەیوەندی هەمیشەییان بەیەکترەوەو شەونشینی‌و هەواڵپرسینو سەردانی یەکتر جۆرێکە لەتایبەتمەندی‌یەکانی ژیانی کۆمەڵگاکە. زۆرجار بەرچاومان کەوتوە کە بەبێ بەرامبەر ئیش بۆ یەکتر دەکەنو بەکۆمەڵ یارمەتی یەکتر دەدەن کە لەناو کۆمەڵگاکەدا بەگەلکاری ناسراوە بەتایبەتی لەو ئیشانەدا کەپێویستی بەژمارەی زۆری ئیشکەر هەیە لەماوەیەکی کەمدا ئیشەکە تەواو ببێت ئەو گەلکاری‌یە پیادە دەکرێت.

## ناوچەگەری

ناوچەگەریو خزمایەتی لەکۆمەڵگا سەرەتاییو دواکەوتوو و داخراوەکاندا بەجۆرێکە کە(کەسێتی تاك) بوونی نامێنێتو لەناو کۆمەڵگادا وون دەبێت. لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە لەفۆرمی راپرسیدا. لەخشتەی(١٢) خراوەتە روو.

خشتەی(١٢)

هەڵوێستی نموونەی توێژینەوە نیشان دەدات لەسەر ناوچەگەریو خزمایەتی لەهەوراماندا

| ناوچەگەریو خزمایەتی | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| بەهێزە | ٣ | ٢% |
| لاوازە | ١٤٧ | ٩٨% |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | ١٠٠% |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١١)دا دەرکەوتوون. وەڵامی(بەهێزە) رێژەکەی دەکاتە (٢%). وەڵامی(لاوازە) رێژەکەی دەکاتە(٩٨%). ئەو ئەنجامەش ئەوە دەسەلمێنێت لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا گیانی ناوچەگەریو هۆزایەتیو خزمایەتی هەیە بەڵام لاوازە، چونکە لەخشتەی(٧) خرایە روو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای هەورامان پەیوەندی هۆزایەتیو تیرەگەری نەبوون، وە کۆمەڵگاکە لەچینێك یا تیرەیەك پێك نەهاتووە بەڵکو کۆمەڵگاکە جیاوازی چینایەتی هەبوە وە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بەشوێنی نیشتەجێبونیانو بەشێوەزارەکەیانەوە بەستراون، نەك بەرگەزو تیرەو

هۆزەوە، هەر ئەوەش بووە كاریگەری كردۆتە سەر لاوازی خزمایەتی لەناو كۆمەڵگاكەدا، گیانی ناوچەگەری‌و هۆزایەتی لاواز كردووە.

## تۆڵە سەندنەوە

تۆڵە سەندنەوە دیاردەیەكە لەناو كۆمەڵگا هۆزایەتی‌و تیرەگەری‌و سەرەتایی‌و دواكەوتووەكاندا شانازی پێوە دەكەن.

لەو بارەوە پرسیارێكمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەكە كردووە، لەفۆرمی راپرسیدا. لەخشتەی(١٣) خراوەتە روو.

خشتەی(١٣)

هەڵوێستی نموونەی توێژینەوەكە نیشان دەدات لەسەر دیاردەی تۆڵە سەندنەوە

| تۆڵە سەندنەوە | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١١ | %٧,٣٣ |
| نەخێر | ١٣٩ | %٩٢,٦٧ |
| كۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیاری‌یەكانی نموونەی توێژینەوەكە كە لەخشتەی(١٣) دەركەوتوون. وەڵامی(بەڵێ) رێژەكەی دەكاتە(٧,٣٣%)، وەڵامی(نەخێر) رێژەكەی دەكاتە(٩٢,٦٧%). ئەو ئەنجامەش ئەو راستییە بەدەستەوە ئەدات كە لەناو كۆمەڵگای هەوراماندا گیانی تۆڵە سەندنەوە نزمەو گیانی لێبوردن بەرزە. چونكە لەخشتەی(٩) دەركەوتوە كەئاستی خوێندەواری كۆمەڵگاكە باشە خوێندەواریش فاكتەری لەناوبردنی گیانی تۆڵە سەندنەوەیە، هەروەها فاكتەری هوشیاركردنەوەو چارەسەركردنی كێشەو گیروگرفتە كۆمەڵایەتی‌یەكانە. كۆمەڵگای هەورامان بەكۆمەڵگایەكی هۆشیارو رۆشنبیر بەرچاو كەوتووە هەر

لەوكاتانەوە کە بیارەو تەوێڵە دوو مەڵبەندی گرنگی فێرکردنی زانستە ئایینییەکان بوون ئەوە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە بە پەیدابوونی خوێندن و خوێندەواری نوێ دەرگای قوتابخانەو خوێندنگا نوێکان لەهەوراماندا کراونەتەوەو کۆمەڵگاکە پێشوازیی لەخوێندنی نوێ کردووە. ئەوانەش هەموو فاکتەرن کەکێشەو گیروگرفتی کۆمەڵایەتی کەم بکەنەوەو گیانی تۆڵە سەندنەوە لەناو بەرن بۆیە کۆمەڵگای هەورامان زۆر بەکەمی ئەو گیانەی تیا بەدی دەکرێت هەروەك لەخشتەکەدا هەڵوێستی نموونەی توێژینەوەکە خراونەتە روو.

## پەیوەندییەکان و شوێنی نیشتەجێ بوون

لەفۆرمی راپرسییەکەدا پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە، لەسەر پەیوەندییەکانی ئەندامانی کۆمەڵگای هەورامان، ئایا پشت دەبەستن بەشوێنی نیشتەجێ بونیانەوە؟ لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا نموونەی توێژینەوەکە زۆرینە بە(بەڵێ) وەڵامیان داوەتەوە. ئەوەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە کەشوێنی نیشتەجێ بوون کاریگەری هەیە لەسەر بەهێزبوون یا لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

## ژن بەژن

دیاردەی ژن بەژن لەبەشێکی ناوچەکانی کوردستاندا پەیڕەو دەکرێت و بۆتە نەریتێکی کۆمەڵایەتی. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردوە، ئایا دیاردەی ژن بەژن لەهەوراماندا پەیڕەودەکرێت؟ وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە زۆرینەی بە(نەخێر) بووە. ئەو زانیارییە راستییەك نیشان دەدات،

ئەویش ئەوەیە کۆمەڵگای هەورامان مەبەستیەتی توخمی خزمایەتی فراوان بکاتو پەیڕەوی دروست کردنی دیاردەی(خێزانی دەرەکی) بکاتو بنبڕی هەندێك نەخۆشی بۆ ماوەیی بکات کە لەئەنجامی دیاردەی ژن بەژن دا بەهۆی خزمایەتییەوە پەیدا دەبن.

### فرە هاوسەری

فرە هاوسەری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەو لەکۆمەڵگا ئیسلامیو رۆژهەڵاتییەکاندا زیاتر پەیڕەو دەکرێت. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(١٤) خراوەتە روو.

خشتەی(١٤)

هەڵوێستی نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر دیاردەی فرە هاوسەری لەهەوراماندا

| فرە هاوسەری | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| نەخێر | ١٠١ | %٦٧,٣٣ |
| بەڵێ | سفر | سفر |
| هەندێ جار | ٤٩ | %٣٢,٦٧ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١٤) دەرکەوتوون. وەڵامی(بەڵێ) ئاماژەی پێ نەدراوەو رێژەکەی(سفر%). وەڵامی(نەخێر) رێژەکەی دەکاتە(%٦٧,٣٣). هەروەها وەڵامی(هەندێ جار) رێژەکەی دەکاتە(%٣٢,٦٧). کۆمەڵگای هەورامان لەبەر ئەوەی روو لەئاینینە، ئایینیش هاندەرە بۆ فرە هاوسەری ئەوە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە باری ژیانو گوزەرانو جوگرافیاو کۆمەڵایەتی هاندەرن بۆ زۆری ژمارەی خێزان. ئەوانە فاکتەری هاندەرن بۆ فرە هاوسەری لەهەوراماندا.

## جۆرەكانى هاوسەرێتى

هاوسەرێتى جۆرى زۆرەو لەناو كۆمەڵگاكاندا چەشنەكانى جياوازە. لەفۆرمى راپرسيدا، لەو بارەوە پرسيارێكمان ئاراستەى نموونەى توێژينەوەكە كردووەو سێ جۆر هاوسەرێتيمان دەست نيشان كردوون. لەخشتەى(١٥) خراونەتە روو.

خشتەى(١٥)

راى نموونەى توێژينەوەكە نيشان دەدات لەسەر هاوسەرێتى

| جۆرەكانى هاوسەرێتى | ژمارەى نمونە | رێژە% |
|---|---|---|
| خزم | سفر | سفر |
| خەڵكى هەورامان | ١٠٧ | %٧١,٣٤ |
| نا هەورامى | ٤٣ | %٢٨,٦٦ |
| كۆى گشتى | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانيارييەكانى نموونەى توێژينەوەكە لەخشتەى(١٥) دەركەوتوون. وەڵامى هاوسەرێتى لەگەڵ(خزم)دا ئاماژەيان پێ نەداوەو رێژەكەى(سفر%). بەڵام وەڵامى هاوسەرێتى لەگەڵ(خەڵكى هەوراماندا) رێژەكەى دەكاتە(٧١,٣٤%). هەروەها وەڵامى هاوسەرێتى لەگەڵ(ناهەورامى)دا رێژەكەى دەكاتە(٢٨,٦٦%). ئەو وەڵامانەش راستييەك بەدەستەوە دەدەن كەئەويش ئەوەيە، خەڵكى هەورامان پەيرەوى(هاوسەرێتى دەرەكى) دەكەن‌و لايان پەسەندە. مەبەست لەدەرەكى هەوراميیەكان لەگەڵ خزم‌و بنەماڵەكەى خۆياندا هاوسەرێتييان پێ باش نىيە، بەڵكو لەگەڵ هەوراميیەكان كە خزمايەتيان پلەى يەك‌و دوو نىيەو ياهەر نەناسراويشە يا نا هەورامى بێت پێ باشترەو لايان پەسەندە.

لەخشتەکەدا ئەوە دەرکەوتووە کەخەڵکی هەورامان لایان چاکترە لەناو هەوراماندا ژیانی هاوسەریتی پێك بهێنرێت، بەڵام لەگەڵ نا هەورامیشدا نەدراوەتە دواوەو بەرێژەیەکی زۆر خواستی لەسەربوە، بەتایبەتی ئەوانەیان کەخاوەنی بڕوانامەی زانکۆن زۆرینەیان ئاماژەیان بەوە داوە کەهاوسەریتی لەگەڵ نا هەورامیدا پەسەندە تا لەگەڵ هەورامیدا. بەهەرحاڵ کەسەرنجی وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە دەدەین ئەو راستی‌یە دەرکەوتووە کەهەورامی‌یەکان لەگەڵ خزمدا ژیانی هاوسەرێتی‌یان لاپەسەند نی‌یە، بەڵکو بەگشتی هاوسەرێتی دەرەکی‌یان پێ باشترە. هەروەها خشتەکە راستییەك بەدەستەوە ئەدات کەهێشتا کۆمەڵگای هەورامان لەژیانی هاوسەرێتیدا پەیڕەوی داب‌و نەریتی کۆن دەکات‌و جۆرێك لەهاوسەرێتی پەیڕەو دەکات کەپێی دەوترێت(هاوسەرێتی لەگەڵ خزم‌و ناسیاو) ئەوەش نیشانەی هوشیاری‌و دووربینی‌ی خەڵکی هەورامانە کە لەپاشەڕۆژدا ئەو جۆرە هاوسەرێتی‌یەیە کێشەو گیروگرفتیان بۆ دروست ناکات.

## تەمەنی شوکردن

تەمەنی شوکردن بەپێی ئایینەکان‌و بەپێی داب‌ونەریتی کۆمەڵگاکان‌و تەنانەت لەیاساشدا رای جیاوازی لەسەرە. لەفۆرمی راپرسیدا پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوە کردووە. لەخشتەی(١٦) خراوەتە روو.

خشتەی(١٦)

رای نموونەی توێژینەوە نیشان دەدات لەسەر تەمەنی شوکردن

| تەمەنی شوکردن | ژمارە | رێژە٪ |
|---|---|---|
| ١٨ ساڵ | ١١٤ | ٪٧٦ |

| ٢٠ ساڵ | ٣٦ | ٪٢٤ |
|---|---|---|
| کۆی گشتی | ١٥٠ | ٪١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١٦) دەرکەوتوون. بەرای خەڵکی هەورامان(١٨) ساڵ تەمەنی گونجاوە بۆ شوکردن کەرێژەکەی دەکاتە(٪٧٦). (٢٠) ساڵ تەمەنی شوکردنە کەرێژەکەی دەکاتە(٪٢٤). ئەو وەڵامانەی سەرەوەش ئەوە دەگەیەنێت کەتەمەنی(١٨) ساڵ کەرێژەکەی(٪٧٦) تەمەنی گونجاوە بۆ شوکردن لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا. ئەم خشتەیە راستییەك بەدەستەوە ئەدات کە کۆمەڵگای هەورامان هێشتا کۆمەڵگایەکی داب‌و نەریتی‌یەو بەپێی ئایین‌و داب‌ونەریتی کۆمەڵایەتی کچەکانیان بەشوو دەدەن‌و کۆمەڵگایەکی تازە پێنگەیشتوە. هەروەها راستییەکیش بەدەستەوە دەدات کە کچ لەو تەمەنەدا خاوەنی رای خۆیەتی‌و دەتوانێت بڕیاری هاوسەرێتی بدات یان نەدات دوور لەکاریگەری دەسەڵاتی خێزان، کەواتە رەگەزی(مێ) بەرادەیەکی باش سەربەست‌و ئازادە لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا.

وەك لەخشتەکەدا دەرکەوتووە دیاردەی زوو بەشوودانی کچ کە لەکۆمەڵگای کوردەواری‌دا پەیڕەو دەکرێت بەتایبەتی لەلادێ‌کانی کوردستاندا، ئەو دیاردەیە لەکۆمەڵگای هەوراماندا پەسەند نی‌یەو کچەکانیان بەشوو نادەن تاکو نەگەنە تەمەنی ١٨ساڵ. هەروەها لەخشتەکەشدا دەرکەوتوە بەرێژەیەکی زۆر ئاماژە بەوە دراوە لەو تەمەنەش بەرەو سەروتر گونجاوترە بۆ بەشودانی کچ، هۆی ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ هۆشیاری‌ی کۆمەڵگاکە کە کچەکانیان لەپاشەڕۆژدا کێشەو گیروگرفتی خێزانیان بۆ دروست نەبێت.

## تەمەنی ژن هێنان

تەمەنی ژن هێنان لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر لەداب‌و نەریتێکەوە بۆ داب‌ونەریتێکی تر لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر لەئایینێکەوە بۆ ئایینێکی تر لەیاسایەکەوە بۆ یاسایەکی تر جیاوازی هەیە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەوبارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(١٧) خراوەتە روو.

خشتەی(١٧)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر تەمەنی ژن هێنان لەهەوراماندا

| تەمەنی ژن هێنان | ژمارەی خێزان | رێژە% |
|---|---|---|
| ٢٥ ساڵ | ١١٣ | %٧٥,٣٣ |
| زیاتر | ٣٧ | %٢٤,٦٧ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١٧) دەرکەوتوونە. خەڵکی هەورامان رایان وایە(٢٥) ساڵ تەمەنی ژن هێنانی کورەکانیانە بەرێژەی(٧٥,٣٣%). وە پێیان وایە(زیاتر) تەمەنی ژن هێنانە بەرێژەی(٢٤,٦٧%). خشتەکە ئەو راستییە دەسەلێنێت لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا دیاردەی(زوو ژن هێنان) خواستی لەسەر نیەو دراوەتە دواوەو پەسەند ناکرێت. چونکە ئەو دیاردەیە لەپاشە رۆژدا کێشەو گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی زۆری بەدواوەیە. هەروەها لەرووی ئابوریشەوە کاریگەری خراپی ئەبێت لەسەر ژیانی خێزانی کورەکانیان، جگە لەوەی کاریگەری خراپی تری هەیە لەسەر خێزانەکە کەئەو کورەی زوو ژن بێنێت پەیوەندی‌یەکانی لەگەڵ باوک‌و دایک‌و خوشک‌و براکانیدا

زوو لاواز دەبن، چونکە هێشتا تەمەنی ژیری کامڵ نەبوەو کێشەو گیروگرفتەکانی خێزانی دوری دەخەنەوە لەپەیوەندی‌یە کۆمەلاّیەتی‌یەکانی رۆژانەی. دوریش نی‌یە لەبەر بەرژەوەندی ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی‌ی خێزانەکە ئارەزوو نەکەن لەسەر ئەوەی کەکورەکانیان زوو ژن بهێنن، چونکە کوڕ لەکۆمەڵگاکەدا هاوکاری‌یەکی باشی ژیانی ئابووری خێزان دەکات لەرێی پیشەکەیەوە دەرامەت پەیدادەکات بۆ خێزانەکەی.

## جۆری خێزان

خێزان جۆری زۆرە، لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕێت، بەپێی کاریگەری فاکتەرەکانی کۆمەلاّیەتی، ئابووری، رامیاری، ئایینی‌یەوە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(١٨)دا خراوەتە روو.

خشتەی(١٨)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر جۆری خێزان لەهەورامان‌دا

| جۆری خێزان | ژمارەی خێزان | رێژە% |
|---|---|---|
| خێزانی بچوك | ١٤٩ | %٩٩,٣٣ |
| خێزانی پێکهاتوو | ١ | %٠,٦٧ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١٨) دەرکەوتوون. لەکۆی گشتی نموونەی توێژینەوەکە کە(١٥٠) خێزانە. (١٤٩) خێزان پەیڕەوی(خێزانی بچوك) دەکەن بەرێژەی(٩٩,٣٣%). هەروەها(١) خێزان ئاماژەی بەجۆری(خێزانی پێکهاتوو) کردووە،

بەرێژەی(٦٧,٠%). ئەم دیاردەیە لەکۆمەڵگای کوردەواریدا تەنها لەهەوراماندا پەیڕەو دەکرێت کەخێزانی بچوك لایان پەسەندترە لەجۆرەکانی تری خێزان، کەخۆی دیاردەیەکە زۆرتر لەشارەکاندا پەیڕەو دەکرێت نەك لەلادێ نشینەکاندا. رەنگە هەورامییەکان ئەزمونێکیان هەبوبێت لەو بارەوە کەئەویش ئەوەیە بەزوو جیابونەوەو دوورکەوتنەوە لەماڵە باوان لەزۆر کێشەو گیروگرفتەکان دوور دەکەونەوە. هەروەها خێزانی نوێ زۆرتر پێك دێتو سەربەستو ئازاد دەبێتو هەست بەلێپرسراوێتی گوزەرانو ژیان دەکاتو دڵسۆز تر دەبێت لەڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانیدا لەڕوی ئابوری‌یەوە چونکە هیچ پشتیوانێکی تری نی‌یە کەهاوکاری بکات.

### پرسو راکردن بەهاوسەر

هەروەك لەکوردەواریدا باوە(ژنو ماڵ، یا ژن خاوەنی ماڵە) بەپێی ئەو دیاردەیە دەبێت هاوسەری ژیان(ژن) لەکاروباری رۆژانەی خێزاندا پرسو رای پێ بکرێت. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(١٩) خراوەتە روو.

لەخشتەی(١٩)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر پرسو راکردن بەهاوسەر لەکۆمەڵگای هەوراماندا

| پرس کردن بەهاوسەر | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٢٤ | %٨٢,٦٧ |
| هەندێ جار | ٢٦ | %١٧,٣٣ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیاری‌یەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(١٩) دەرکەوتوون. وەڵامی(بەڵێ) ڕێژەکەی دەکاتە(٨٢,٦٧٪). وەڵامی(هەندێ جار) ڕێژەکەی دەکاتە(١٧,٣٣٪).

زانیاریەکانی ئەم خشتەیە ئەوەیان نیشان داوە هاوسەر پرس‌و ڕای پێ دەکرێت لەهەوراماندا، زۆرینە وەڵامەکەیان وایە دەبێت پرسی پێ بکرێت. کەمینە ڕایان وایە(جاروبار) ئەگەر پێویستی کرد پرسی پێ بکرێت، نەك لەهەموو کاروبارێکی خێزانیدا، چونکە هەندێك کاروبار پەیوەست نی‌یە بەهاوسەرەوە. هەروەها هاوسەر لەکۆمەڵگای هەوراماندا ئەرکێکی زۆری لەئەستۆدایە لەڕاپەڕاندنی کاروباری ناوماڵداو بەشداری دەکات لەدابینکردن‌و پەیداکردنی سەرچاوە دەرامەتیەکانی گوزەران‌و بەدەست خستنی زۆر لەپێویستی‌یەکانی ناوماڵ‌و بەشداری دەکات لەبەرهەم هێناندا لەبواری کشتوکاڵی‌و باخداری‌دا. هەندێك لەبەرهەمەکانی پیشە دەستی‌یەکان ژن ئامادەیان دەکات‌و دروستیان دەکات، جگە لەوەی ژن بەرپرسیارە لەپەروەردەکردن‌و بەخێوکردنی منداڵ‌و بەڕێ کردنی میواندا، ئەرکی نان کردن‌و خواردن دروست کردن‌و پاك کردنەوەی ناوماڵ‌و تەنانەت ئاژەڵ ڕاگرتن‌و ڕاپەڕاندنی پێویستییەکانی ئاژەڵداری یەکێکە لەئەرکەکانی ژن، بەو جۆرە ئەرکەکانی ژن دەیسەپێنن کەپێویستە پرس‌و ڕای وەربگیرێت لەهەوراماندا.

## مافی کچ‌و کوڕ لەخێزان پێکەوەناندا

ئەمڕۆ لەجیهاندا جەخت لەسەر مافی مرۆڤ دەکرێتەوەو بەگەرمی لەسەری قسەو باس دەکرێت‌و بۆتە دەنگ‌و باسی کات‌و ڕۆژ. لەفۆرمی ڕاپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە لەخشتەی(٢٠) خراوەتە ڕوو.

خشتەی(٢٠)

**رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر مافی کوڕو کچ لەپێکەوەنانی خێزاندا**

| ماف | ژمارە | ڕێژە% |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٤٣ | %٩٥,٣٤ |
| نەخێر | ٧ | %٤,٦٦ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢٠) دەرکەوتوون. وەڵامی(بەڵێ) ڕێژەکەی دەکاتە(%٩٥,٣٤) وەڵامی(نەخێر) ڕێژەکەی دەکاتە(%٤,٦٦).

ئەو زانیاریانە ڕاستییەك نیشان دەدەن کە(کچو کوڕ) لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا مافی تەواویان هەیە، خۆیان دوای هاوسەرێتی، خێزانی سەربەست پێکەوە بنێنو لەماڵە باوان جیاببنەوەو خێزانی نوێ دروست بکەن. مافی ئەوەیان هەیە خۆیان بڕیار بدەن لەسەر جۆری پیشەو ئیشو کاریانو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانو ڕاپەڕاندنی کاروباری ئایینیو ڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتییەکانیانو دیاریکردنی پاشەڕۆژیانو چۆنیەتی بەخێوکردنو پەروەردەکردنی منداڵەکانیان.

**مافی ژن(ئافرەت)**

ئەمڕۆ لەجیهاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە پێویستە(ئافرەت) وەك(پیاو) یارەگەزی(مێ) وەك ڕەگەزی(نێر) سەربەست بێتو مافەکانی پارێزراو بن لەهەموو بوارێکی ژیاندا. لەفۆرمی ڕاپرسییەکەدا لەوبارەوە دوو پرسیارمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردون. لەوەڵامی هەردوو پرسیارەکەدا زۆرینەی وەڵامەکان بە(بەڵێ) بوە.

پرسیار/ کاك(سەلاح) رێ ئەدەی بەکچەکەت بخوێنێت)؟ وەڵام/ بەڵێ، ئەگەر خوێندنی تەواوکرد رێی ئەدەیت بەتەنها بچێتە شارەکانەوە خوێندنەکەی تەواو بکات؟ وەڵام/ بەڵێ، ئەی ناترسیت تووشی لادانو سەرکێشی ببێت؟

وەڵام/ کچی لای ئێمە هەر لەمندالێییەوە سەربەستو ئازادە، بەتەنها دەچێتە ناوباخو بێستان، بەبەهاراندا دەچێتە شاخو داخ بۆ گەڕانو ئاهەنگو خۆشیو هەندێك گژوگیای بەهارە کۆدەکەنەوەو دەیهێننەوەو دەیکەن بەخۆراك، ئەو کاتە نەترساوم کەمندالْ بووە، ئێستا بۆ دەبێت بترسم کە گەورە بووەو فامی کردۆتەوەو ئاستێکی بەرزی خوێندەواری هەیە. ئەگەر مەبستت شتی تریشە، ئەوەش هەر مافی خۆیەتی هاوسەری خۆی هەڵبژێرێت بەئارەزووی خۆی، لێرەش بێت هەر ئەو مافەی هەیە، ئەگەر مەبستتە لەوە زیاتر تێپەڕێت، ئەوە کچی لای ئێمە وا پەروەردە کراوە کارێك ناکات کەرێو رەسمو دابونەریتی کۆمەڵایەتی ببەزێنێت. ئێمە دڵنیاین لەکچەکانمان کارێك ناکەن کە کەسایەتیان لەکەدار بێتو ببێتە مایەی سەرزەنشت کردنی لەلایەن کەسوکارییەوە.

## چارەسەری کێشەی کۆمەڵایەتی

مرۆڤو کۆمەڵگاکان لەگەڵ کێشەو گیروگرفتەکاندا هەمیشە ململانێیانە، وەك دیاردەیەك بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤایەتی بنبەست نەکراونو هەمیشە کێشەی نوێ پەیدا دەبێتو بەرۆکی مرۆڤو کۆمەڵگاکان دەگرێت. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێك ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کراوە لەخشتەی(٢١)دا خراوەتە روو.

خشتەی(٢١)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی‌یەکانیان

| چارەسەری کێشەکان | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| خۆت‌و خێزانەکەت | ١٢ | %٨ |
| خزم‌و کەس‌وکار | ٨ | %٥,٣٤ |
| دادگاو یاسا | ١٣٠ | %٨٦,٦٦ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢١) دەرکەوتوون. (١٢) سەرەك خێزانیان بۆ چارەسەری کێشەو گیروگرفتەکانیان پشت بە(خۆیان‌و خێزانەکانیان) دەبەستن، بەرێژەی(%٨). هەروەها(٨) سەرەك خێزان بۆ چارەسەی کێشەکانیان هانا بۆ(خزم‌و کەس‌وکار) دەبەن، بەرێژەی(%٥,٣٦). وە(١٣٠) سەرەك خێزان کێشەو گیروگرفتەکانیان لەرێگای(دادگاو یاسا) وە چارەسەردەکەن بەرێژەی(%٨٦,٦٦).

ئەو زانیاریانە راستییەك نیشان دەدەن ئەویش ئەوەیە کۆمەڵگای هەورامان بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتەکانیان پشت بە(دادگاو یاسا) دەبەستن، کەواتە داب‌ونەریتی کۆمەڵایەتی دراوەتە دواوە لەچارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای هەوراماندا، بۆیە(ئەنجومەن‌و ریش سپی‌و مەلاوشێخ‌و پیاوماقوڵ) هیچ ئاماژەیەکیان پێ نەدراوە لەچارەسەری کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکاندا. هەرچەندە لەکۆمەڵگای هەوراماندا کێشەو گیروگرفت کەمە زۆر بەکەمی کێشەکانیان روبەڕوی دادگاو یاسا دەبنەوە. ئەگەر هاتوو کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکان قورس بوون‌و خێزان‌و کەسوکار بۆیان چارەسەرنەکران ئەوساکە روبەڕوی دادگاو یاسایان دەکەنەوە.

## باسی سێیەم

# ژیانی ئابووری

### دەرامەت:

ژیانی ئابووری هەموو چالاکیو جمو‌جوڵەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە بەمەبەستی بژێویو گوزەران. لەفۆرمی راپرسییەکەدا پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە کەئایا دەرامەتی هەورامان بەشی پێویستییەکانتان دەکات؟ وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە زۆرینەیان بە(نەخێر) بووە. ئەو وەڵامە ئاماژە بەوە دەدات دەرامەتەکانی کۆمەڵگای هەورامان کەمن، بەشی پێویستییەکانیان ناکەن. لەم سەردەمەدا پێویستی‌یەکانی ژیان زۆربوونو دەرامەتەکان گۆڕانێکی بەرچاویان بەسەردا نەهاتووە، نەکارگەیەك کراوەتەوە، نە سەرچاوەیەکی تری بەدەست هێنانی دەرامەت بۆ کۆمەڵگاکە دەستەبەر کراوە، بۆیە دەرامەتەکان بەشی دابینکردنی پێویستی‌یەکان ناکەن.

### روبەری زەوی:

زەوی یەکێکە لەتوخمەکانی بەرهەم هێنان، رۆڵو کاریگەری هەیە لەسەر زۆرو کەمیو چاكو خراپی بەرهەم. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە، ئایا کەمی روبەری زەوی هاندەر بووە رەزو باخ دابنێن؟ وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە زۆرینەیان بە(بەڵێ) بووە. ئەو وەڵامەش راستییەك بەدەستەوە ئەدات کەروبەری کشتوکاڵی لەهەوراماندا کەمە بۆیە خەڵکەکەی بەماندووبوونێکی زۆر جۆری کشتوکاڵەکەیان گۆڕیوە لەڕووەکەوە بۆ دارودرەختو رەزو باخ تا پێویستییەکانیان پڕبکەنەوە.

**پیشە دەستی‌یەکان:**

لەجیهاندا پیشە دەستییەکان زیاتر پەسەندنو خواستیان لەسەرە لەناو هەموو پیشەسازییەکاندا. بەڵام روو لەکزینو بەرەو لەناوچوون دەچن، چونکە بەرهەمی کارگە جێی پێ لێژ کردوون. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە، ئایا پیشە خۆماڵی‌یەکانتان لاپەسەندن؟ لەوەڵامی نموونەی توێژینەوەکە بە(بەڵێ) بووە. ئەو وەڵامە ئاماژە بەوە دەدات کەپیشە دەستی‌یەکانی هەورامان هێشتا لای کۆمەڵگاکە پەسەندنو خواستیان لەسەرە. ئەو پیشانەی هەورامان کەخواستیان لەسەرەو تا ئێستا لای هەورامییەکان پەسەندنو گران بەهان گرنگترینیان چنینو رستنو چەرمو کانزاکردنن وەك(شاڵ، کلاش، بەرماڵ، مەوج، جاجم، شاڵینە، خەرار، لفکە، گۆرەوی، چەقۆ، ... هتد) بەکورتی دوان لەو پیشە دەستی‌یانە دەخەینە روو:-

**کلاش کردن:** کلاشی هەورامان بەناوبانگە جۆرێکە لەپێلاو، کەرەستەکانی لەپەڕۆو چەرمو دەزوو پێك دێن، وەرزی‌یەو هاوینەیە لەگەڵ ئاوو تەڕیی‌دا ناگونجێت، سوکەو فێنکە قاچ بۆن ناکاتو تەندروستە، گران بەهایەو ئەركو ماندوبوونو خەرجێکی زۆری دەوێت، زۆر بەرگە دەگرێتو قایمە، راستو چەپی بۆ نی‌یە هەر تاکێکی بۆ هەردوو قاچ دەشێتو دەتوانرێت رۆژانە یا هەفتانە پێوپێ بکرێنو بگۆڕێن، تاکی قاچی چەپ بکرێتە قاچی راستو بەپێچەوانەشەوە. هەردوو رەگەز(نێرو مێ) بەشداری دەکەن لەدروست کردنیدا، لەدووبەش پێك هاتووە بەشی ژێرەوەی پێی دەوترێت(ژێرە کلاش) لەپەڕۆو چەرم دروست دەکرێتو وەستای خۆی هەیە کەپێی

دەوترێت(كلاشكەر) ئەم بەشەی كلاش رەگەزی نێر دروستی دەكات، چونكە پێویستی بەهێزو تواناو ماندووبون هەیە. بەشی دووەمی پێی دەوترێت(سەرە كلاش) هەردوو رەگەزەكە(نێرو مێ) دەیچنن. ئەو كەرەستانەی كەبەكار دەهێنرێت لەدروست كردنی كلاش دا جگە لەپەڕۆو چەرمو دەزوو ئەمانەیە(كۆتە، مشتە، درەوش، دەقاق، تەبەنێ،... هتد) دواتر ئەو دوو بەشە بەیەكەوە دەبەسرێنو شیازە دەدرێنو ئامادە دەكرێت بۆ بەكارهێنان. كلاش جۆری زۆرەو بەناوبانگەكانیان(گیوەیی، تایبەتی، بازاڕی)یە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری پاشكۆی(٨)بكە.

**رانكو چۆغە(شاڵ)**: یەكێكە لەپیشە دەستیەكانی چنینو رستن، پۆشاكێكی نایابە، هەردوو رەگەزی(نێرو مێ) لەدروست كردنیدا بەشداری دەكەن، دوو جۆرە: جۆری یەكەم رانكۆچۆغەی خوریە: لەخوری(مەڕ) دروست دەكرێت. جۆری دووەم رانكوچۆغەی مەرەزە: لەتوكی(بزن)ی مەرەز دروست دەكرێت. جۆری زۆرە وەك(خورمایی، كەشی، سپی، شینكی) سوكەو گەرمە بۆ زستانو فێنكە بۆ هاوین، گران بەهایە، بەدوو قۆناغ بەرهەم دەهێنرێت، قۆناغی یەكەم رەگەزی(مێ) دەستی پێ دەكات، لەشتنو شی كردنەوەو پاك كردنەوەو رستنو تا دەیكاتە گلۆڵە. قۆناغی دووەم رەگەزی(نێر) تەواوی دەكات لەرێگەی وەستاوە كەپێی دەوترێت(جۆلا ) وەدەبێت جۆلا رەگەزی نێر بێت چونكە ئەو قۆناغە پێویستی بەماندوبونو هێزو توانای زۆر هەیە، كە لەتوانای رەگەزی مێدا نیە. جۆلا شاڵەكە دروست دەكاتو دەیكاتە پارچەیەكی درێژ، كەدرێژیەكەی جیاوازە لە(٣٠-٤٠) مەتر دەبێتو پانییەكەی لە(١٠-١٥) سانتیمەتر دەبێت. دواتر دەنێررێت بۆ(بەرگدروو) ئەویش دەیدروێتو ئامادە دەكرێت بۆ لەبەر كردن. بۆ زانیاری زیاتر سەیری پاشكۆی(٨) بكە.

**کارگە:**

کارگەو کارخانەی گەورە لەناو هەج کۆمەڵگایەكو هەج وولاتێکدا دامەزرابێت، نیشانەی پێش کەوتنو بەرزبونەوەی ئاستی گوزەرانو پێش کەوتنی ئابووری ئەو گەلەیە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە، ئەگەر کارگە بکرێتەوە لەهەوراماندا کەرەستە خاوەکانی دەستەبەردەکرێن؟ زۆرینەی وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە بە(بەڵێ) بووە. ئەو وەڵامەش ئاماژە بەوە دەدات لەسنوری جوگرافیی کۆمەڵگای هەوراماندا کەرەستە خاوەکانی هەندێك پیشەسازی دەست دەکەون، جگە لەکەرەستە خاوەکان لەهەوراماندا دەستی کار بەکرێیەکی کەم دەستەبەر دەکرێت، هەروەها خەڵکەکە شارەزاییان هەیە لەهەندێك پیشەسازیی سووك دا بەتایبەتی پیشە دەستییەکان. ئەگەر کارگەیەك دابمەزرێت لەسنورەکەدا بێگومان کاریگەری دەبێت لەسەر گۆڕینی ژیانی ئابووری کۆمەڵگاکە.

**بازرگانی:**

ئاڵوگۆڕکردنو جموجوڵی بازرگانی لەهەج کۆمەڵگایەکدا هەبێت بێگومان پێداویستییەکانی ژیان بەئاسانی دەستەبەر دەکرێن. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە، ئایا بازرگانی لەهەوراماندا گەشە دەکات؟ زۆرینەی وەڵامی نموونەکە بە(بەڵێ) بووە. ئەو وەڵامەش راستییەك نیشان دەدات ئەویش ئەوەیە(چالاکیی بازرگانی) لەهەوراماندا لاوازە زۆرتر کۆمەڵگاکە پەیڕەوی سستمی ئابووری خۆبژێوی کردووە هەرچەندە دەرامەتەکانیشی کەم بوون ئەگەر بێتوو بەراورد بکرێت لەگەڵ زۆری خواستەکانو ژمارەی دانیشتواندا، دوور نییە هەندێك پێویستی کۆمەڵگاکە

بەئاسانی دەستەبەر نەکرێن‌و دەست نەکەون لەکاتی پێویستدا ئەگەر کێشەو گیروگرفتێك روو لەکۆمەڵگاکە بکات، چونکە ئێستا زۆرینەی پێویستی‌یەکانی ژیان لەدەرەوەی هەورامان دابین دەکرێن.

## هەورامان وەك پێویست ئاوەدان نەکراوەتەوە

هەورامانی لهۆن- حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك پێویست ئاوەدان نەکراوەتەوە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(٢٢) خراوەتە روو.

خشتەی(٢٢)

وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر ئەوەی هەورامان وەك پێویست ئاوەدان نەکراوەتەوە

| فاکتەرەکانی ئاوەدان نەکردنەوەی هەورامان | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| نائارامی باری رامیاری‌و شەڕوشۆڕ | ٣١ | %٢٠,٦٧ |
| بێ دەرامەتی‌و هەژاری خەڵکەکە | ٤٤ | %٢٩,٣٣ |
| بێ خاوەنی‌و بێ حکومەتی | ٢٣ | %١٥,٣٣ |
| خراپی هەڵوێستی بەرپرسەکان | ٤٨ | %٣٢ |
| دەوڵەمەندەکانی هەورامان یارمەتی نادەن | ٤ | %٢,٦٧ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢٢) دەرکەوتوون. ئاوەدان نەکردنەوەی هەورامان دەخەنە ئەستۆی ئەم فاکتەرانە بەم جۆرە: بەرێژەی(٢٠,٦٧%) دەیخەنە ئەستۆی خراپی باری رامیاری ناوچەکەو ئەو شەڕو ئاژاوە ناوخۆییەی کەماوەیەکی دوورو درێژ بەرۆکی

هەورامانی گرتبوو، بەڕێژەی(٢٩,٣٣٪) هۆی بێ دەرامەتیو هەژاری خەڵکەکە دەکەنە فاکتەری ئاوەدان نەکردنەوەی هەورامان، بەڕێژەی(١٥,٣٣٪) حکومەتو بێ خاوەنی دەکەنە هۆی ئاوەدان نەبونەوەی هەورامان، بەڕێژەی(٣٢٪) خراپی هەڵوێستی بەرپرسەکان بەرامبەر هەورامان دەکەنە هۆی ئاوەدان نەبونەوەی هەورامان، بەڕێژەی(٢,٦٧٪) ئاوەدان نەکردنەوەی هەورامان دەخەنە ئەستۆی دەوڵەمەندەکانی هەورامان.

زانیارییەکانی ئەو خشتەیە ئەوە نیشان ئەدەن کەکۆمەڵێك فاکتەری کاریگەر هۆی ئاوەدان نەبونەوەی هەورامانن. لەسەروو هەمویانەوە(هەڵوێستی خراپی بەرپرسەکان) کەزۆرترین خێزان ئاماژەیان پێداوەو بەرزترین ڕێژەی هەیە لەخشتەکەدا.

تەواوکەری ئەم پرسیارە بەشێکی تری لەفۆرمی ڕاپرسیەکەدا کەئاراستەی نمورنەی توێژینەوەکە کراوە، بۆچی هەورامییەکان کۆچ ناکەنەوە لەشارەکانەوە بۆ هەورامان؟ لەخشتەی(٢٣)دا خراوەتە ڕوو.

خشتەی(٢٣)

وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر نەگەڕاندنەوەی هەورامیەکان لەشارەکانەوە بۆ هەورامان

| کۆچ نەکردنەوە بۆ هەورامان | ژمارە | ڕێژە٪ |
|---|---|---|
| نەبونی شوێنی نیشتەجێ بون(خانو) | ٣٦ | ٪٢٤ |
| نەبونی ئیش‌وکار لەهەورامان | ٣٤ | ٪٢٢,٦٧ |
| دڵنیا نەبوون لەباری رامیاری | ٣١ | ٪٢٠,٦٦ |
| نەبونی هاندەرو دڵسۆز | ٤٢ | ٪٢٨ |

| راهاتنیان لەسەر ژیانی شار | ٧ | ٤,٦٧٪ |
|---|---|---|
| کۆی گشتی | ١٥٠ | ١٠٠٪ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢٣) دەرکەوتوون. هۆی نەگەڕانەوەو کۆچ نەکردنەوەی هەورامییەکان لەشارەکانەوە بۆ هەورامان بەکۆمەڵێك فاکتەر دەزانن بەم جۆرە. بەرێژەی(٢٤٪) دەیگێڕنەوە بۆ نەبونی شوێنی نیشتەجێ بوونو نەبونی خانوو، بەرێژەی(٢٢,٦٧٪) دەیگێڕنەوە بۆ نەبونی ئیشو کار لەهەوراماندا، بەرێژەی(٢٠,٦٦٪) دەیگێڕنەوە بۆ دڵنیا نەبونیان لەباری رامیاری، بەرێژەی(٢٨٪) دەیگێڕنەوە بۆ نەبونی هاندەرێكو دڵسۆزێکی هەورامان، بەرێژەی(٤,٦٧٪) دەیگێڕنەوە بۆ راهاتنیان لەسەر ژیانی شار.

وەڵامەکانی خشتەی(٢٣) لەیەکەوە نزیکن، دیارە ئەو فاکتەرانە وەك یەك کاریگەرییان هەیە لەسەر کۆچ نەکردنەوەی هەورامییەکان لەشارەکانەوە بۆ هەورامان. بەڵام نەبونی هاندەرێكو دڵسۆزێك زۆرترین خێزان ئاماژەیان پێداوەو بەرزترین رێژەی هەیە، دەبێت ئەو فاکتەرە لەوانی تر کاریگەرتر بێت. بەڵام رای ژمارەیەکی خەڵکی هەورامانمان وەرگرت لەسەر ئەوەی بۆچی ناگەڕێنەوە بۆ هەورامان رای زۆرینەیان لەیەکەوە نزیکەو پێیان وایە ژیانو گوزەران لەناو شارەکاندا ئاسانتر دەستەبەر دەکرێتو ماندووبونو ئەرکی زۆری ناوێتو پاشەڕۆژی منداڵەکانیان رونترەو بەفیڕۆناچێت، چونکە لەشارەکاندا ئیشوکار زۆرەو هەمە چەشنەیەو هەورامییەکان لەگەڵیاندا راهاتونو دەتوانن کارەکان راپەڕێنن بەئاسانی وە منداڵەکانیان فێری ژینگەی شارەکان بوونو

لەگەڵ ژینگەی هەوراماندا ناگونجێن بەتایبەتی لەڕوی خوێندنو خوێندەواریو رۆشنبیریو زۆری ئامرازو هۆکارەکانی پەروەردەو فێرکردنو کەناڵەکانی راگەیاندنەوە.

**جیاوازی لەنێوان شارەکانو هەورامان لەڕوی ئابووریەوە:**

ژیانی شار لەگەڵ ژیانی دەرەوە بێگومان لەکۆمەڵێك رووەوە جیاوازی هەیە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نمونەی توێژینەوەکە کردوە، زۆرینەی وەڵامی نمونەی توێژینەوەکە بە(بەڵێ) بووە. ئەوەش وەڵامێکە کەڕاستی جیاوازی نێوان ژیانی شارو ژیانی دەوروبەری شار دەسەلێنێت. بۆیە نمونەی توێژینەوەکە لەوەڵامەکانیاندا هاودەنگ بوون.

**کۆسپ (گیروگرفت):**

ژیانی بێ گیروگرفتو کۆسپو تەگەرە هیچ واتایەك نابەخشێت، تەنها ئاژەڵ ژیانی بێ کۆسپ بەسەر ئەبات بەڵام مرۆڤ ژیانی لێوان لێوە لەکۆسپو تەگەرە، توانایەکی واشی هەیە هەمیشە زاڵ ئەبێت بەسەریاندا بۆ هەر گیروگرفتێك چارەسەرێکی داناوە، لەفۆرمی راپرسیدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نمونەی توێژینەوەکە کردووە، ئایا هیچ گیروگرفتێك هەیە لەبەردەم ژیانی ئابووری هەورامان؟ وەڵامی نمونەی توێژینەوەکە زۆرینەی بە(بەڵێ) بووەو کۆمەڵێك فاکتەر دیاری کراون کە ئاستەنگن بۆ ژیانی ئابووریی هەورامان لەوانە(جوگرافیا، رامیاری، کۆمەڵایەتی). ئەو وەڵامەش راستییەك بەدەستەوە ئەدات ئەویش ئەوەیە ژیانی ئابووریی کۆمەڵگای هەورامان گیروگرفتو ئاستەنگی زۆری هەیە بۆ پێش خستنی پێویستی بەکاتو ماندوبونێکی زۆر هەیە.

**مولکایەتی:**

دیاردەی مولکایەتیو خاوەندارێتی یەکێکە لەدیاردە کۆمەڵایەتیو مێژوویی‌یەکان کە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤایەتی رۆڵو گرنگی خۆی هەیەو هەبووە، هەروەها خسڵەتێکی رەسەنو تایبەتمەندی ژیانی مرۆڤایەتی‌یە. لەفۆرمی راپرسییەکەدا لەو بارەوە، پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(٢٤) خراوەتە روو.

خشتەی(٢٤)

وەڵامی نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر جۆری مولکایەتی

| جۆری مولکایەتی | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| تایبەت | ٧٨ | %٥٢ |
| دەوڵەت | ٧٢ | %٤٨ |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | %١٠٠ |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢٤) دەرکەوتوون. مولکایەتی(تایبەت) بەرێژەی(٥٢%)و مولکایەتی(دەوڵەت) بەرێژەی(٤٨%) لایان پەسەندە.

ئەم زانیاریانە راستییەك نیشان ئەدەن کەئەویش ئەوەیە کۆمەڵگای هەورامان جۆری مولکایەتی(تایبەتو دەوڵەت) پەسەند دەکەن، دیارە ئەو دوو جۆرە مولکایەتی‌یە دەستەبەری هەندێك لەپێویستی‌یەکانی کۆمەڵگاکە دەکەنو سەرچاوەی سەرەکی ژیانو گوزەرانن کەخەڵکی هەورامان پشتی پێ بەستوون. بەڵام مولکایەتی تێکەڵ لای تێکڕای نموونەی توێژینەوەکە پەسەند نیەو دراوەتە دواوەو ئاماژەی پێ نەدراوە، چونکە خەڵکەکە ئەزمونی پێشینەیان هەیە لەگەڵ ئەو جۆرە مولکایەتی‌یەدا کەجگە لەمساندوبوونو رەنج بەفیڕۆدان کێشەو

گیروگرفتیان بۆ دروست بووەو ئەو دەرامەتەی کەدەستیان کەوتووە لەو جۆرە مولکایەتی‌یەدا بەشی پێویستی‌یەکانی نەکردون.

**فرەکاری تاکە کەس:**

کەسایەتی تاکە کەس لەهەندێ کۆمەڵگادا تواوەتەوەو لەهەندێکی تردا بوونی خۆی سەلماندوە. لەفۆرمی راپرسیدا لەو بارەوە پرسیارێکمان ئاراستەی نموونەی توێژینەوەکە کردووە. لەخشتەی(٢٥) خراوەتە روو.

خشتەی(٢٥)

رای نموونەی توێژینەوەکە نیشان دەدات لەسەر فرەکاری تاکە کەس لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا.

| فاکتەرەکانی فرەکاری تاکە کەس | ژمارە | رێژە% |
|---|---|---|
| زۆری پێویستییەکان | ٥١ | ٣٤% |
| ناوبانگی | ٤٣ | ٢٨,٦٧% |
| بەفیڕۆنەدانی کات | ٥٦ | ٣٧,٣٣% |
| کۆی گشتی | ١٥٠ | ١٠٠% |

زانیارییەکانی نموونەی توێژینەوەکە لەخشتەی(٢٥) دەرکەوتوون. رێژەی(٣٤%) زۆری پێویستییەکان بەفاکتەری فرە کاری تاکە کەس دەزانن. وە رێژەی(٢٨,٦٧%) بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی‌و ناوبانگی‌ی بەفاکتەری فرەکاری تاکە کەس دەزانن. وە رێژەی(٣٧,٣٣%) بەفیڕۆنەدانی کات بەفاکتەری فرەکاری تاکە کەس دەزانن.

زانیارییەکانی ئەم خشتەیە ئەو فاکتەرانەیان خستونەتە روو کەدەبنە هۆی فرەکاری تاکە کەس لەناو کۆمەڵگای هەوراماندا. وە تاکە کەس بەهۆی کارەکەیەوە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بەدەست دێنێت. بێگومان خشتەکە ئەو راستییەی سەلماندووە کەتاك لەهەوراماندا فرەکارە، ئەوەش

